# کۆمەڵگای نموونەیی

## بەشی یەکەم و دووەم

## یەکگرتن و کۆمەڵی دەروون



نیازي محمد شاكر

# کۆمەڵگای نموونەیی

## بەشی یەکەم و دووەم
## یەکگرتن و کۆمەکی دەروون

نووسینی نیازی محمد شـــاکر

١٤١٩ هـ - ١٩٩٩ ز

بسم الله الرحمن الرحیم

# پێشەکی

گشت بیردۆزە کۆمەڵایەتییەکانی جیهان کە پەیوەندیان بەئادەمیزادەوە هەیە سەلماندویانە کە مرۆڤ زیندوەرێکی کۆمەڵایەتییە بەجۆرێك ناتوانێت بەتەنیاو دوور لەکۆمەڵ بژیت، هەرچەندە هەموو پێداویستەکانی ژیانی بۆ دابین بکرێت و هەرچی دڵ و دەروونی دەیخوازێت بۆی ئامادە بکرێت ناتوانێت بژیت بەبێ پەیوەندی کردنی بەکۆمەڵ و دەوروبەریدا، بەڵکو بەپێچەوانەوە لەهەوڵدانێکی بەردەوام و نەوەستاودایە بۆ بەهێز کردن و پتەو کردنی پەیوەندییەکانی لەگەڵ دەوروبەریدا بەشێوەیەك کەلەگەڵیدا بگونجێت واتە مرۆڤ لەگەڵ یاسای ژیان نەگونجێت و پەیوەندی لەگەڵ دا نەکات ناتوانێت بژیت بەڵکو هەر نازیت، واتە (کردارەکە پێچەوانەیە)بەمانای ئەوەی هەر چەندە پێویستیەکانی دابین و ئامادە بکرێت پێویستی بە کۆمەڵ دەوروبەری دا زیاترو بەهێزتر دەبێت.

ئەمەش لای هەموو کەسێك ڕوون و ئاشکرایە وە لەپەیوەندیەکانی رۆژانە بەرچاو دەکەوێت کە کاتێك مرۆڤێك هەرچەندە دەوڵەمەند ببێت جاچ لەزانست یاخود سامان یان هەر پلەو پایەێك سەیردەکەی پێویستی بەپەیوەندی کردن و رێکخستنی پەیوەندیەکانی بەکۆمەڵ و دەوروبەر زیاتر دەبێت.

کۆمەلیش بەگشتی لەسەر چەند مەبەست و وئامانجێك کۆدەبێتەوەو کاردەکات لەپێناو گەیشتن بەئامانج و مەبەستەکانی بەڵام هیچ کۆمەڵێك جاهەر جۆرێك و ڕەگەزێك بێت ناتوانێت بگات بە ئەنجام و کرداری مەبەست بەبێ پەیوەندی کردن و یەك گرتنی گشت چین و توێژە کانی ئەم کۆمەڵەیە بۆ گەیشتنی بەم ئەنجامە.

کۆمەڵگای نموونەیی

بەمانای ئەوەی هەر گەلێك لەڕێگای پەیوەندی کردنی گشت چین و توێژەکانی بەیەکتری دەتوانێ ئامانج و داواکاریەکانی خۆی مسۆگەر بکات وە گەیشتن بەئەنجام و مەبەست پێویستی بەبەخشین و خۆبەخت کردنێکی زۆر هەیە وە ئەمەش دەکەوێتە ئەستۆی تاك وکۆمەڵ کەپێویستە لەسەر گشت لایەك و دوور لە ڕێرەو ڕێبازی تایبەتی خۆیان کاربکەن و ڕیزەکانی خۆیان ڕێك بخەن بۆ گەیشتن بەئامانج وئاواتی گەلەکەیان بۆهەمان مەبەست خودای گەورەو میهرەبان لە قورئانی پیرۆزدا تیشك دەخاتە سەرگرنگی یەك بوونی کۆمەڵی باوەڕداران وداوایان لێ دەکات لەسەر شێوەی واجب کەیەك بگرن کە دەفەرموێت : ﴿یأیها الذین امنوا اصبروا وصابروا ورابطوا واتقوا اللّٰه لعلکم تفلحون﴾ آل عمران: ٢٠٠

لێرەداو بەپشتیوانی خودای گەورەو میهرەبان بەپێی توانا باسی ئەم کۆمەڵگایەنموونەیی یە دەکەین کەخودای گەورە و میهرەبان بنچینەکەی بۆمان دارێژتووە بەهۆی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) و لەم پەرتوکەدا باسی دووبنەما دەکەین لەبنەماکانی کۆمەڵ یەکەمیان پەیوەندی بەکۆمەڵەوە هەیە کە یەکگرتنە و دووەمیش پەیوەندی بەدڵ و دەروونی مرۆڤەوە هەیە (تاك) بەناوی کۆمەکی دەروون ئەگەر چی باسەکانمان بەشێوەیەکی کورتیش روون کراوەنەتەوە بەڵام هەر بەئومێدین کە خوێنەر لێمان زویر نەبێت ئەگەر هەرکەم و کوریەك و یەك نەگرتنی ماناو مەبەستیشی بەرچاوی بکەوێت و بەهیوای ئەوین کەبەدڵی گەورەی خۆیان لێمان ببورن ئەگەر شتی لەم جۆرەشیان بەرچاو کەوێت وە لەبڵاوکراوەکانی تردا بەپشتیوانی خودای گەورە باسی بنچینکانیتر دەکەین کە بریتین لەمافەکانی مرۆڤ، خوێندن و زانست، دەستووری وولات..هتد.

**نیازی مجمد شاکر**

١٩٩٩/١/١

**کۆمەڵگای نموونەیی:**

پەرەسەندن و پێش کەوتن یەکێکە لەخەونە پیرۆزوهەرە بەرزەکانی گشت کۆمەڵگایەک، گەیشتن بەئەنجام پێویستی بەبوونی یاساو رێرەوێك هەیە واتە دانان و داهێنانی پرۆگرامێك لەچوارچێوەی ستراتیجی ئامانجەکانی گەلەوەو بڵاوکردنەوەی لەناو کۆمەڵ دا بەجۆرێك وا لەباوەر پێکراوانی بکات کەکاری بۆبکەن و بەگوێرەی ئۆرگانەکانیان دەست بکەن بەرێکخستن و پەیوەندی کردن بۆ کۆکردنەوەی گشت ئەو پێداویستیانەی کەپێویستن بۆ بنیات نانی کۆمەڵێکی بەسوود لە رێگەی پشت بەستنیان بەوپرۆگرامە دارێژراوانەی کەلە رێگەیەوە دەتوانرێت سوود بەتاك و کۆمەڵ بگات.

بەڵام پێوستە ئەم رێبازوپرۆگرامانە لەگەڵ کەلەپوورو خوورەوشتی‌ئەم کۆمەڵە بگونجێت و دژگەی نەبێت بەمانای ئەوەی پێچەوانەی داب و نەریتی ئەم کۆمەڵگایە نەبێت بەڵکو دەبێت بەشێوەیەك بێت کە زۆر ترین بەش لەچین و توێژەکانی ئەم کۆمەڵە بگرێتە خۆی و لەسەری دابرێن و کۆك بن تاوەکو بتوانن لەرێرەوی شارستانیەت دانەبڕێن و بتوانن بەشێکی زیندوو بەکردار بگرن لەنێوان گەلانی سەردەم دا.

ئێمەی موسڵمانیش خۆمان بەبەختەوەر دەزانین کەخاوەن پرۆگرام ورێبازێکی خوداین کە بەشێوەکی راست و رەوان پەیوەندی تاك و تاك، تاك وخودای گەورە دیاری دەکات وە وەڵامێکی پروپڕە بۆگشت ئەو پرسیارانەی تاوەکو ئێستا بێ وەڵام ماوەنەتەوە لەلایەن هەندێك کەس دا هیچ گومانی تیادا نیە کەئایینی موسڵمانیەت لەناخ و دەروونی ئادەمیزدا دەستی کرد بەبنیات نان و داهێنانی کۆمەڵگایەکی بەسوود و بەهێز بەجۆرێك تۆی خۆشەویستی مرۆڤایەتی‌و بەزەیی چاند بەکردارێك بیری ئادەمیزادی گەڕاندەوە بۆ سەدەیەکی زوو بۆ کرداری دروست

کردنی ئادەمیزاد کە چۆن یەکەم جار لەیەك تاکەکەس درووست کراون وەبەمەش هەستی برایەتی و خوشکایەتی لەنێوانیادا رواند.

ئەمەش گشتی بۆ زیاتر لەیەکتر گەیشتن و نزیك کردنەوەی مرۆڤ بوو لەیەکتری دا بەمەبەستی دارشتن و دارژاندی بنچینەی کۆمەلگایەکی بەهێزو بەسوو بوو کەلەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿يايها الناس اتقوا ربكم الذي خلقكم من نفس واحدة وخلق منها زوجها وبث منها رجالا كثيراً ونساء﴾ النساء: ١

مرۆڤ کەلەم ئایەتە قول دەبێتەوە داواکاری ئەمری خودای گەورەو میهرەبانی بۆ روون دەبێتەوە لەگرنگی دارشتنی کۆمەل لەسەر بنچینەی برایەتی و خوشکایەتی دوور لەدووبەرەکی رەگەزو رەنگ دا، واتە هەر کۆمەڵێك بەپێی ئەوینەما دارێژراوانە دێتە کایەوەو کە ئەم گەلە یاخوود ئەم کۆمەڵە لەسەری دا کۆبوونەتەوە وەهەر بەشێوەیەك گۆران کاری لەپێك هاتوەکانی ئەم بنەمایانە دەکات کەلەگەڵ باری رامیاری ئابووری ئەم گەلە بگونجێت و لەلایەکی تردا هەندێك گەل و نەتەوە بەپێی پەیوەندیە نێو دەوڵەتیەکان و پەیوەندیەرامیاریەکانی لەگەڵ دەوڵەتەکانی دەورووبەری‌دا رێکی دەخات و گۆران کاری تیادا دەکات رۆژ بەدوای رۆژ بەجۆرێك کەلەگەڵ ئەم گۆران کاریانە بگونجێت بەکردارێك کەکارنەکاتە سەربنەمایە سەرەکی‌یەکان بەتایبەتی بنەمایە ئایینی‌یەکان.

وەلەباسی داهاتوودا بەشێوەیەکی کورت باسی بنەمەکانی کۆمەڵ دەکەین.

## بنەماکانی کۆمەڵگا:

بەلگە نەویستەکە هەر ئامێرێك جابەهەر شێوەێك بێت سەیردەکەی لەداهێنان و پێکهاتنی‌دا پشت بەچەند بنچینەێك و بنەماێك دەبەسترێت وەلە رێگەی ئامادەکردنی ئەم پێداویستیانە ئەم ئامێرە دەکەوێتە کار وبەردەوام دەبێت وەهەر

کاتێك یەکێك یان بەشێك لەم بنچینانە لەکار بەکەوێت کاردەکاتە سەر ئەم ئـامێرەو لەکاری دەخات لەڕێگەی کارکردن و کاردانەوەی بەسەر گشت پێکهاتوەکانی تری ئەم ئامێرەدا.

بەهەمان شێوەش کۆمەڵی مرۆڤایەتی پێك دێت و پشت دەبەستێت بەچەند بنچینەو بنەمایـەك کەلەڕێگەیـەوە پێکهاتـەی کۆمـەڵ پێـك دێـت و لەسـەریدا دەڕوات بەئومێدی پەرەسەندن وبەردەوام بوونی ئەم کۆمەڵگایە لەداهێنان دا.

کەواتە بنەماکانی کۆمەڵ بریتین لەو بنچینانەی کەبـە کۆکردنەوەیان کۆمـەڵ دێتـە خۆگرتـن لـەڕێزی کۆمەلایـەنی تـری جیـهان بەشـێوەیەك دەتوانێـت لەڕێگەیـەوە بەهەموو کردارێکی کۆمەلایەتی هەڵبستێت، وبناسرێت لەنێوان نەتەوەکانی‌تردا.

بنـەماکانی کۆمـەڵیش دەکرێتـە سـێ بەشـی سـەرەکی بنـەما (ئایینیـەکان، پێکهێنەکان، کردایەکان) وەهەربنـەمایێك لـەم بنەمایانـە پشت بەچـەند بنچینەیـەك دەبەستێت لەڕێکخستنی کۆمەڵ و گەل دا:

## یەکەم: بنەما ئایینیەکان:

بنەمائایینیـەکان گشت ئـەو فـەرمان و داواکاریانـە دەگرێتـەوە کەخراوەتـە سـەر ئەستۆی مرۆڤ لەلایەن خودای گەورەو میهرەبان کەپێویستە لەسەر مرۆڤ ڕێنمایی ئەم داواکاریانە بکات و لەسەر یان بڕوات بەشێوەێك کـارو کردەوەکـانی بـەگوێرەی ئەم یاسـاو ڕێـرەوە ڕێـك بخـات وە لەهـەمان کـاتدا پێویستـە بنـەما پێکهێنـەکان و کرداریەکان لەگەڵ بنەما ئایینیەکان بگونجێت بەجۆرێك بکرێـت بەسـەر چـاوە بـۆ دارێژتن و داهێنانی بنەماکانی تری کۆمەڵ.

## دووەم: بنەما پێکهێنەکان:

بریتین لەکۆمەڵێك کردارو پێداویستی پێویست کە پێویستە بەدی بکرێت لەگشت کۆمەڵێك و نەتەوەیەك دا بۆ ئەوەی بتوانێت لەرێگەیەوە بگۆرێت لەشێوەیەکی نارێك و پەرت وبڵاو بۆ شێوەیەکی رێك و دیاری کراو.

وەئەم کردارو پێداویستییانە بریتین لە (خاك، گەل، زمان، مێژوو، ئاوات وئامانجی هاوبەش) کەلەرێگەی بوون وداهێنانی ئەم پێداویستییانە دەتوانرێت گەلێك و وولاتێکی بەهێز بێتە کایەوە لەرێزی گەلانی تردا.

## سێیەم: بنەما کرداریەکان:

ئەم بنەمایە پێك دێت لەکۆمەلێك بنەمای دروست کراو بۆ چەند مەبەستێکی دیاری کراو و سنووردار کەلەرێگەی کارکردن و کاردانەوەی سیستەمە درێژراوەکانیان پێکهاتەی کۆمەڵ پێك دێت بەجۆرێك تواناى بەردەوام بوونی دەبێت کەلەرێگەیەوە ئەم کۆمەڵەیە لەکۆمەلانیتری جیهان جیادەبێتەوەو دەناسرێتەوە لەرابردوو و داهاتوودا وەئەم بنەمایانەش بریتین لە بنەمای (خێزانی، رامیاری، رۆشنبیری، ئابووری) هەروەها بنەما سووپاییەکان لەخۆوە دەگرێت لەهەندێك کۆمەڵگادا بەهۆی ئەوتایبەتمەندیەی کەسوپا بەخۆیەوە دەگرێت لە گۆران کاری کۆمەڵ و گەل دا وەبنەمای ئابووری و رامیاری بەگرنگترین بنەماکانی کۆمەڵی بەهێز دادەنرێت کەبە تەواو کردن و پێك هاتنی ئەم دووبنەمایە دەتوانرێت گەل بەرەو بنچینەیەکی گرنگ ئاراستە بکرێت کە بەککرتن و یەك بوونی گەلە کەبە گرنگترین بنچینەکانی کۆمەڵی نموونەییو گەلی بەهێز و بەتوانا دەژمێردرێت.

وەکو باسمان کرد بنەما ئاینییەکان بەگرنگترین بنەماکانی کۆمەڵ دادەنرێت بەجۆرێك دەبێت بنەماکانی تر لەگەڵیدا بگونجێت و تەباییەك هەبێت لەداڕێژتن و داهێنانی بنچینەکانیان بۆیە لێرەدا بەگرنگی دەزانم باسی ئەم بنچینە سەرەکیانە بکەین.

## بنچینەکانی کۆمەڵگای نموونەیی:

لەباسەکانی پێشوودا پێناسەی بنەماکانی کۆمەڵمان کردو بنەما ئاینیەکانمان بەگرنگترین سەرچاوەی بنەماکانی تری کۆمەڵ دانا کەبریتی بوو لەگشت ئەو فەرمان و داواکاریانەی کە خراوەتە سەر مرۆڤ لەلایەن خودای گەورەو میهرەبان کەپێویستە مرۆڤ پەیرەوی بکات و رێنمایی داواکاریەکانی بکات لەکاتی ئەنجام دانی خوا پەرستی و لەکاتی کار کردنیدا.

ئێمەی موسڵمانیش کەخاوەن رێبازو رێرەوێکی پیرۆزین پێویستە لەسەرمان کە رێنمایی فەرمان وداواکاریەکانی خودای گەورەمان بکەین بەپێی ئەو داواکاریو فەمانانەی کەلە قورئانی پیرۆزو فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) ریز کراوەتەوەو داهێنراوە بەبێ کەم و کوری ئەویش دەگەرێتەوە بۆ ئەوەی کە پەیامی موسڵمانان زەمینەیەکی لەباریەرێگا خۆشکەر دادەنرێت بۆ هێنانەدی ئەو ئامانجانەی کەکۆمەڵگای نموونەی بەخۆیەوە دەگرێت شایەنی باسیشە قورئانی پیرۆز هەڵدەستێت بەکرداری رێکخستنی ژیانی ئادەمیزاد لەرێگەی دارشتنی ئەو بنچینەو بنەمایانەی کە پێویستن بۆ بینات نانی مرۆڤێکی کراوە ئەویش بەدارشتنی یاسایەك کە هەڵدەستێت بەکرداری رێکخستنی پەیوەندی لەنێوان تاك وتاك، تاك و خوای گەورەو میهرەبان کەتیایدا مافەکانی مرۆڤ دیاری دەکات و هەروەها کارە خراپەکانیش وەکو سیستەمێك سزای تایبەتی بۆ داناوە.

بۆیە پێویستە لەسەر هەر ئادەمیزادێك کەباوەری بەپەیامی خودای گەورەو میهرەبان هەیە کەرێنمایی گشت ئەو فەرمان و داواکاریانە بکات کەلەم پەیامە پیرۆزەدا هاتووە بۆیە بەپێویستی دەزانم کەتیشکێك بخەمەسەر بنچینە سەرکیەکانی کەلە پەیامی خوادی گەورە ومیهرەبان نەخشەی بۆ کێشراوە وەیەکەم هەنگاو کەدەستی پێ بکەین یەکگرتنە لەبەر ئەوەی یەکگرتن بەهەنگاوێکی پراکتیکی گرنگ دادەنرێت لەهەر کۆمەڵگایێك دا.

**کۆمەڵگای نموونەیی**

یەکگرتنی گەل بەیەکەم هەنگاوی پراکتیکی خولقێنەر دادەنرێت کەتیایدا نەتەوە وەکو هێزێکی چالاکی پڕ گوڕ بەیەک هەست ویەک گیان دێتە نێوان ململانێکانی ژیانی گەلان، ئەویش بەهۆی پەیوەندی کردنی بەگشت لایەنەکانی ژیان لەکردارە تەکنیکییەکان وپیشەسازییەکان ...هتد،

ئەم کردارانەش لەلایەن خۆیانەوە پێویستیان بە پیشتیوانی ئابووری ودارایییەکی زۆر هەیە تابتوانرێت لەرێگەیەوە گشت پێداویستیەکانی ئەم گەلە ئامادەبکرێت بەکردارێك کەشێکی لەبارو درووست دابهێندرێت بۆ گشت کردارەکان وەئەم کردارەش تەنها بەهۆی یەکبوون ویەك گرتنی گشت چین و توێژەکانی ئەم نەتەوانە بەدەست دەگات..

نموونەشمان بۆ ئەم جۆرە چالاکییانە.زۆرە لەهەموویان گرنگتر سیستەمی کۆمپانیاکانە کەلەرێگەی کۆکردنەوەی هێزە بەچووك و هێزی وجەسەریەکانەو دەست دەکات بەکار کردن وبنیات نان لەرێگەی خستنەکاری ئەم پاشەکەوت و ئابوونانەی کە داهاتی سەرەکی لێ پێك دێت وەبەرێکخستنێکی تایبەت بەهۆی سیستەمێکی دارێژراو لە نێوان گشت شەریکەکان (بەشەکان)دا دەتوانێت ئەم کۆمپانیانەبگەن بەئەنجامی باش و بڕیاری سەرکەوتوانەش دەربەگەن لەکاتی پێویست و تایبەت دا.

بەهەمان شێوە نەتەوەش پێویستی بەهەمان رێکخستن و یەك بوون هەیە لەنێوان پارت و رێکخراوە سیاسییەکانی دا بەشێوەیەك کەبتوانرێت کۆبکرێتەوە لەسەریەك بڕیار بەمەبەستی گەیشتن بەستراتیجی دوور لەبەر ئەوەی گشتیان بۆ یەك ئاوات و ئامانج کاردەکەن بەڵام هەرلایەنێك رێگاو چارەیەکی تایبەتی هەڵبژاردووە بۆگەیشتن بەئامانجە دارێژراوەکان.

## کۆمەڵگای نموونەیی

کەچی مێژووی جیهان وگشت بیرۆکە کۆمەلایەتی‌یەکان سەلماندوویانە کەتەنها لەرێگەی یەك بوون و یەکگرتن گەلان دەتوانن بگەن بەئامانج بەشێوەیەك ئەنجامی چاك بەدەست بەهێنن و لەریزی نەتەوەکانی تریش دا جێگەی خۆیان بگرن.

یاسای ژیانیش (پەیامی خودای گەورەو میهرەبان)ئەم لایەنەی لەیاد نەکردووە بەڵکوو هەنگاوێك بووە بۆ بەمرۆڤایەتی بوونی چالاکیەکان و بەردەوام بوونی ژیانی گەلان.

کەتیایدا یەکگرتنی بەبنچینەیەك دارشتووە کەلەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت:

﴿یاایها الذین امنوا اتقوا الله حق تقاته ولاتموتن الا وانتم مسلمون، واعتصموا بحبل الله جمیعاً ولاتفرقوا واذکروا نعمة الله علیکم اذ کنتم اعداءً فألف بین قلوبکم فأصبحتم بنعمته اخوانا﴾ آل عمران: ١٠٣

شایەنی باسیشە ئەگەر بێت و قۆناغەکانی چۆنی‌یەتی پیلانی داگیر کەران بخوێنیتەوە بە تایبەتی ئیمریالیزم هۆی تەئکید کردن و بەگرنگ زانینی یەکگرتنی کۆمەڵمان بۆ روون دەبێتەوە بەشێوەیەك زیاتر لەپیلانە گلاوەکانی ئەوان شارەزا دەبین و دەزانین ئەم قورئانە تەنها رێگەی باشمان پیشان دەدات و سەرچاوەی ژیانمانە کە لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿ان هذا القران یهدی للتی هي اقوم﴾، بەجۆرێك کە وەلامی گشت پرسیارەکانت دەداتەوە وەبۆت روون دەبێتەوە ئەگەر بێت و بەباشی بیر لەقۆناغەکانی چۆنی‌یەتی داگیرکردنی گەلان بکەیتەوە سەیر دەکەی یەکەم خاڵ کەدەستی پێ بکەن بەجۆرێك کەدەست دەخەنە ناو کاروو باری کۆمەڵ بۆ ئەوەی لەکۆتاییدا دەست بگرن بەسەر شوێنە بزوێنەکانی گەل و نەتەوە هەوڵ دانیانەبۆ لێك ترازان ولێك کردنی کۆمەڵ و بەش بەش

كردنیەتی بەمانای بەكگرتن یەكەم كردارەكە بەرەنگاری دەبنەوە لە ڕێگەی دروست كردنی بیرو ڕێرەوی جیاواز لەنێوان چینەكانی كۆمەڵ بەمەبەستی بەش بەش كردنی كۆمەڵ و بێ هێز كردنی ئەمەش بەلێك ترازانی گەلێ وەئەم كردارەش بەگوێرەی سوود وەرگرتن لە داب و نەریتی كۆمەڵ لەلایەك و لەلایەكی تر باری كۆمەڵ و گەل دەورێكی گرنگ دەبینێ لەكرداری مێژوو تائێستا بەچەند قۆناغێك دا ڕۆیشتووە بەجۆرێك لەهەر قۆناغێك دا جۆرە سیستەمێك و پیلانێكیان بەكار هێناوە، ئەمەش وەكو باسمان كرد باری گەل وداب و نەریتی كۆمەڵ دەوری خۆی دەبینێت لەوكەرتەدا.

## قۆناغەكانی پیلان گێران:

لێرەدا بەشێوەیەكی كورت باسی چۆنیەتی داگیر كردنی گەلان دەكەین لەڕێگەی باس كردنی جۆری پیلان و چۆنیەتی جێبەجێ كردنیان لەلایەن وڵاتە داگیر كەرەكان بۆ سەر ئەوگەلانەی كە داگیریان كردووە بەتایبەتی ئیمرالیزم كە هەردەم لەهەوڵ دان دایە بۆ دەست بەسەر داگرتنی گەلانیتر.

### قۆناغی یەكەم:

بەكۆتایی هاتنی دەست هەڵاتی ئایینی جۆرێك بە دەست بەسەر داگرتنی بازرگانی دەستی پێ كرد لەجیهاندا بەتایبەتی لەئەوروپادا ئەمەش بووەهۆی بەش كردنی خەڵك بۆسەر دوو چین، چینی هەژار كە پێك دەهات لەجوتیارو كرێكار لەگەڵ چینی دەوڵەمەند كەپێك دەهات لەخاوەن زەوی و كەل وپەلی نرخدار ئەم كردارەش بووە هۆی پێش بركێ كردنی خەڵك بۆ كۆكردنەوەو پیلان كێشان بۆ داگیركردن و دەست بەسەر داگرتنی زەویو زاری خەڵكی تر بەتایبەتی دەست بەسەر داگرتنی زەوی ئەو جۆرەكەسانەی كەبێ دەسەتهەڵات و بێ توانابوون بەمەبەستی

بەرزبوونەوەیان لەچینی هەژار بۆدەوڵەمەند کەلەئەنجام دا بووە هۆی دروست بوونی دووبەرەکی چینایەتی لەنێوان کۆمەڵی هەژارو و چینی خاوەندار، بەمەش کرداری چەوساندنەوەو لەناوبردنی گەلان دەستی پێ کرد بەهۆی پێش برکی کردنی چینی سەرمایەدار بۆ کۆکرنەوەی زۆر ترین وچاکترین بەش لەسەرمایە بەبەکارهێنانی خراپترین پیلانی داگیرکەرانە بۆ چەوساندنەوەی ئەم گەلانە و دەست بەسەرداگرتنیان.

وەبەگوێرەی ئەم پیلانە داگیرکەرانە هەڵسو کەوتی خۆیان رێك دەخستو پیلانیان دەکێشا لەگەڵ ئەم گەلە ستەمدیدانەدا کەئەنجامەکەی بووە هۆی جولانەوەو تەقینەوەی هەستی نەتەوایەتی لەناو چەند گەلانێك دا.

## قۆناغی دووەم:

لەم قۆناغەدا وەبەهۆی دروست بوونی هەستی نەتەوایەتی لەناوگەلانداوە بەهۆی داگیر کردنی داگیر کەران و بەتایبەتی ئیمپریالیزم بۆ خاك و شاروشارۆچەکەکانی جیهان لەپێناو بەدەست کەوتنی زۆرترین بەش لەکەل وپەل بەتایبەتی لەو شوێنانەی کەدەولەمەند بوون بەکەل وپەلی کانزایی و ژێرزەوی بەمەش سەرمایەو کەل و پەلی جیهان کەوتە ژێر دەستی چەند چینێکی کەم لەجیهاندا لەسەر حسابی پاش کەوتن و کەم بوونی داهاتی گەلانیتردا کەئەنجامەکەی بووە هۆی دروست بوونی گۆڕان کاریەکی گەورە لەجیهانی سەرمایەداریدا ئەویش بەدروست بوونی سیستەمی (ئیشتراکی) لەروسیادا و بلاوبوونەوەی بەجیهان دا و کار کردنی ئەم سیستەمە دژ بەسیستەمی سەرمایەداری و رەت دانەوەی سیستەمی سەرمایەداری کەدژیە یەکتر هەموو جۆرە پیلانێکیان دەکێشا بۆ بەسەر خستنی بیرورای خۆیان ئیجا بەهەر شیوەیەك بیوایە.

## کۆمەڵگای نموونەیی

لەم بەشەدا ئیمپریالزم هەوڵیدا بەشێوەیەکی تر دەست بەسەر جیهان دا بگرێت لەرێگای پشت بەستن بە کرداری دووبەرەکی و هەوڵ دان بۆ درووست کردنی زیاتر لەیەك لایەن بۆ لەیەك کردن ولێك دوور کەوتنەوەی کومەڵ لەیەکتری دەستی کرد بەهاندانی خەڵك بۆ دووبەرەکی چینایەتی و ئایینی لەناو یەك کۆمەڵ و گەلانی یەکگرتوودا.

لەهەمان کات دا ئیمپریالزم دەستی کرد بەدروست کردن و هەڵ قولاندنی جۆرێك تەنگێشەی هەرێمایەتی لەنێوان چەند هەرێمێك دا بەکردارێك کەبتوانێ وا لەم هەرێمانە بکات کەلەگەل یەکتری شەرو ئاژاوە بهێننەوە بەجۆرێك وەکو نوێنەرێك بۆ داگیر کەران شەڕ بکەن بەمەبەستی سەرخستنی بیروڕای سیستەمە داگیر کەرانەکانیان وەلەهەمان کات دا ئیمپریالزم دەستی کرد بەدرووست کردنی چەندین هەرێمی جیاجیا لە جیهان دا وەلەسەر بنچینەی بیرو رێبازی جیاجیا بەجۆرێك لەکاتی پێویست و لەهەر کاتێك کە مەبەستی بێت و پێویستی بێت بتەقێتەوە دژ بەهەرێمەکانی تردا بەمەش نەوەستا بەڵکو دەستی کرد بەدابەش کردنی چەند گەلانێکی یەکگرتوو بەهێز لەو نەتەوەو گەلانەی کەبەهیچ جۆرێك سەریان نەنواند بۆ سیستەم وبیرو رای داگیر کەرانەیان بەسەر چەند هەرێمێکدا لەو هەرێمانەی کە بەدوای بیرو رێبازی ئەوان کەوتن و نۆکەرایەتی بیرو رێبازی ئەوانیان دەکرد بەهیوای زیاتر دەست بەسەردا گرتن وچەوساندنەوەی ئەو گەلە بەهێزو یەکگرتوانەدا.

داگیر کەران بەکرداری دامێنانی دووبەرەکی ولێك کردن ودرووست کردنی هەرێم لەسەر بنچینەی چینایەتی لەهەموو جیهاندا نەوستاو بەڵکو لەهەمان کات دەستی کرد بەداگیر کردنی زانستی و رۆشنبیری گەلانیتر لەرێگەی دامەزراندنی چەند

بنکەیێك لەوینکە رۆشنبیریانەی کەبەکرداری بلاو کردنەوەو هاندان هەڵدەستن بۆ سەر خستنی بیرو رێبازی داگیر کەرانەی ئەوان لەهەموو جیهاندا.

هەروەها دەستی کردبە دامەزراندن و داهێنانی یەککگرتنی ئابووری وسوپایی (عسکری) لەجیهان دا بۆ تەقینەوەو دروست کردنی تەنگێشەی جیاواز لەجیهاندا بۆ ئەوەی لەکۆتایی‌دا بتوانێ بەشێوەیەکی زۆر ئاسان دەستی بخاتە بروپیت وداهاتی جیهان هەر چەندە هەندێك جار بەرامبەر و لەسەر حیسابی لەناو بردن ولەناوچوونی گەلانی تریش بێت.

## قۆناغی سێیەم:

لەم قۆناغەدا داگیرکەران لەئەنجامی بلاو بوونەوەی بیری زانستی و رۆشەنبیری لەناو گەلان دا و بەهۆی روون بوونەوەو زانینی خەڵك بۆ پیلان و مەبەستەکانیان هەستیان کرد بەکێشانی پیلانێکی تر ئەویش بە پشت بەستنیان بەئیتفاقیات و بڵاوبوونەوەی خێرا لەناو گەلانی جیهاندا بەدروست کردنی بنچینەی سوپایی ودۆزینەوەی بەندەری ئاوی لەسەر کەناری دەریاو زەریاکان و کار کردنیان بۆ داهێنان و دروست کردنی جۆرێك لەنائارامی لەژیانی وولاتان دا جاچ بەشەریئابووری بێت یاخود بەتووش کردنیان بەشەری جیاجیا لەپێناو مەبەستی جیا لەگەڵ گەلانی تردا بۆ مسۆگەر کردنی بەرژەوەندی خۆیان لەو ناوچانەدا لەهەمان کاتدا بۆ فرۆشتنی زیاتر چەکەی کەون و پەك کەوتوویان وەبەپشت بەستنیان بەداهێنانی جۆرێکی تر لە ناوجەرگەی و خۆیستی لەناگەلان دابەمەستی زیاتر دەست بەسەر داگرتنو ژیر دەست کەوتنیان.

وەبەهیوای لەیەك کردن و دوور کەوەتنەوەی زیاتری کۆمەڵ لەیەکتریدا بێگانە پشتی بەست بەداهێنان و درووست کردنی چەند پارت و بزووتنەوەو رێکخراوێك لەنێوان ئەم گەلانەدا وەبەشێوەیەکی جیاواز لەبیرو مەبەستدا بۆ داهێنان و دورست

کردنی جۆرێك لەبەیەك داچوونی ناو خۆیی لەنێوان ئەم گەلانەدا بۆ ئەم مەبەستەش دەستی کردبە پشتیوانی کردنی هەندێکیان دژ بەهەندێکیترداو وە هانی ئەوانی تری دەدات بۆ هەڵسان دژ بەئەوان وە بەکردارێکی بەردەوام کەبەهیچ جۆرێك رێگە نادرێت بەرێرەوێکی نیشتمانی پەرەبسەنێو هەڵکەوێت لەناو ناخی ئەم گەلانەدا ئەویس لەرێگەی هەوڵ دانیان بۆ دەست بەسەر داگرتنو ژێر دەست کەوتنی راگەیاندن و بڵاوکراوەکان بۆ بڵاوکردنەوەی بیروڕبیازی خۆیان بەشێوەیەکی بڵاو کەبەجۆرێك کەبگات بەهەموو خێزانێك و ماڵێك لەجیهان دا.

هەروەها داگیرکەران ئابووریان وە کوچەکێك بەکارهێنا دژ بە گەلانی تر بەمەبەستی زیاتر تێك دانی چین و توێژەکانی کۆمەڵ لە رێگەی کارکردنیان بۆ لەناوبردن و کارتێکردنی داهات و ئابووری گەلانی تردا بەهیوای ئەوەی مرۆڤ لەم وڵاتانەدا تەنها بەدوای نانی ژیانیدا بگەرێت و بیر لەهیچی تر نەکاتەوە تەنانەت بیر لە سەرچاوەی دەست کەوتنی ئەم نان و داهاتەشی نەکاتەوە ئایا باشە یان خراپە کە ئەنجامەکەی دەبێتە هۆی زیاتر دوور کەوتنەوەی ئەم مرۆڤە لەداب و نەریت و سنورە ئاینیەکان و تووش بوونی بە جۆرێك لە نەزانیو نەفامی دواکەوتنی زانستی لەبەر ئەوەی تەنها بیر لەپارووی ژیانی دەکاتەوە و بیر لەهیچی تر ناکاتەوە گشت ئەم پیلانانەش بەمەبەستی رێگە گرتن بوو لەچینەکانی کۆمەڵ بۆ ئەوەی نەتوانن یەك بگرن لەبەر ئەوەی لەرێگەیەوە دەتوانن بەرەو ئازادی و پێش کەوتن رێگە بگرن و سەربکەون بەسەر داگیرکەران.

کەواتە داگیر کەران کشتیان لەسەر پیلانێك کۆبوونەتەوە کە لە رێگەیەوە کاردەکەن بۆ لێك دوور کەوتن و لێك ترازانی گەلەکەمان بەمەبەستی ئاسان کردنی کرداری داگیر کردن و بێهێز کردنمان لەلایەك و لەلایەکی تر لەرێگەی رێگەگرتن و رێنەدان بۆ کۆبوونەوەمان لەسەر ئاوات و ئامانجێکی هاوبەش بەڵکو جگەلەمە

هەردەم کاردەکەن بۆ هێشتنەوەمان لەشێوەی کۆمەڵ و پارتی جیا جیا و بچوك لەسەر ڕێبازوو ڕێرەوی جیاواز بەمەبەستی مسۆگەرکردنی یەك نەگرتنمان وەك نەتەوەیەك ئێستاو لە داهاتوودا وەبەهۆی ئەم ڕێبازوو ڕێرەوە جیاوازانە ئەم پارت و ڕێکخراوانە کارناکەن بۆ ئەو مەبەست و ئامانجانەی کەلەسەری‌دا دامەزراون کە لە سەرووی هەموویان سەربەخۆیی و ئازادیە بەڵکو کار دەکەن بەشێوەیەکی دیکتاتۆریانەو وە بە بەکارهێنانی هەموو ڕێگەیەك بۆ بڵاوکردنەوەی سەرخستنی ئەو بیرو ڕێبازەی کە لە سەری‌دا دامەزراوون بەرامبەر بەپارت و ڕێکخراوەکانی تردا وەجێ بەجێ کردنی لەسەر چینەکانی کۆمەڵ دا.

بۆیە پێویستە لەسەر گەلان کەدووربەبکەونەوە لەناوچەگەری و خۆیستی ئینجا چ بەهۆی ڕەنگ بێت یاخود ڕەگەز لەبەر ئەوەی بەپێی پەیامی خودای گەورە و میهرەبان بەرزی تەنها بەگوێرەی ترسان لە خودای گەورەو پلەی ڕێنمایی کردنی پەیامی خوای گەورە دەپێورێت بە ئەنجام دانی کاری چاك لە بەندایەتی کردنی خوای گەورە دا ئەمەش گشتی کردەوەی خۆیەتی‌یە وە هیچ پەیوەندیەکی بەرەگزو ڕەنگەوە نی‌یە کە دەفەرموێت لە قورئانی پیرۆزدا

﴿یا أیها الناس إنا خلقناکم من ذکرٍ وأنثی ...﴾ الحجرات: ١٣

و ﴿یا أیها الناس اتقوا ربکم الذی خلقکم من نفسٍ واحدة وخلق منها زوجها وبث منهما رجالاً کثیراً ونساء ...﴾ النساء:

لەلای کەس شاراوە نی‌یە کە هەموو ئەو کردارە ناوچەگەری‌و خۆویستی‌یانە سەلماندویانە کە ناوچەگەری و خۆیستی بەهۆی ڕەگەزو ڕەنگ .. تەنها ڕێگە خۆش دەکات بۆ نا ئارامی و لێك ترازانی چین و توێژەکانی کۆمەڵ وە بەهیچ جۆرێك ئەم بیردۆزانە نەگەی تونەتە ئەنجام و مەبەست لەبەر ئەوەی تەن لە ڕێگەی

کۆمەڵگای نموونەیی

یەکترگرتن دەتوانرێت ئەنجامی چاك و بەکردار و دەست بکەوێت و گەلیش بە ئازادی بگات .

بۆیە پێویستە لەسەر هەموو مرۆڤێك راست گۆ بێت لە بە جێهێنانی یەکسانی و داد پەروەری لەسەر رووی زەمین دا ئەویش بەکار کردن و رێگەگرتنیانە لە هەموو جۆرە تاوانێك و تەعەدایەك کە روودەدات وە لە هەر شوێنێك روویدات پێویستە لەسەر گشتیان یەکتر بگرن بۆ لابردنی بەبێ ئەوەی پرسیار بکەن ئایا ئەوە چ لایەنەکە وکێیە ئەم تاوانەی لە بەرامبەردا کردووە.

بە هەمان شێوە پێویستە لەسەر کۆمەڵی موسڵمان و گەلا نیش بەپێی توانا کاربکەن بۆ کۆکردنەوەی گشت هێزو تواناێك بۆ لابردنی ئەو تەعەدایەو تاوانانەی کە بەسەریاندادێت لەبەر ئەوەی لە کاتی دووبەرەکی و ناخۆشیدا خەڵك لایەنگری لای بەهێز دەکەن لەشەردا.

بەبێ ئەوەی سەیری ستەم کارو بێ تاوان بکەن واتە سەیر کردن و لایەنگرتنیان بۆ لایەنێك بە گوێرەی هێزو توانای لایەنەکەی ترە بۆیە خودای گەورە داوا لەباوەڕداران دەکات کەلەکاتی شەڕو ئاشتیدا هەردەم لەجێگا بەهێزو بەتوانا بن و سەر دانەنوێنن بۆ دوژمن وداگیرکەران و بەهەموو هێزو تواناێك بەرەنگاری ببنەوە کە دەفەرموێت: ﴿وأعدوا لهم ما استطعتم من قوة، ومن رباط الخيل ترهبون به عدو الله وعدوكم وآخرين من دونهم لاتعلمونهم الله يعلمهم﴾ انفال: ٦٠

وەبەپێی ئەم ئایەتە پێویستە لەسەر کۆمەڵی موسڵمان کە هەموو توانای خۆیان بخەنە کار بۆ بەرەنگاری بوونەوەی دووژمنان لە هەموو لایەنێك دا و زانست بەرەوە پێش بخەن و خوێندن بەرز بکەنەوە بەجۆرێك پلەی رۆشنبیری نێرو مێی گەل بەرەوە پێشەوە ببەن وە بە پشتیوانی خوای گەورە لە بەشەکانی تری کۆمەڵێ

نموونەی باسی خوێندن و زانست دەکەین کە لە یەکێك لە بنەما گرنگەکانی کۆمەڵ دادەنرێت.

## ((بەرەو نەتەوەیەکی یەکگرتوو))

مێژوو و جوگرافیای شارستانیەتی هەر کۆمەڵگایك دەپێورێت و بە دیار دەکەوێت بە گوێرەی پلە و چۆنیەتی بیر کردنەوەی تاکەکانی ئەم کۆمەڵگایە.

ئەوەی من بزانم دیاری کردنی کۆمەڵگا لە چوارچێوەیخێزان دا بەڵگەیە بۆ شیکردنەوەیێکی زانستی کە بیری هۆشمەند ئاوێتەیەتی ئەویش لە رێگەی گەرانەوە بۆ خێزان و بە تایبەتی بۆ ئەو تاکانەی کە ئەم خێزانە پێك دەهێنن لە رێگەی دیاری کردنیان بۆ (بیرە کراوو داخراوەکاندا) کە بە هۆیەوە خێزان دیاری دەکرێت وەپێ لە دوای پێ‌دا تا دەگاتە بە کۆمەڵگا کە بە مانای سیاسی گەل دێت.

بە مانای ئەوەی پلەی بیر کردنەوەی هەر مرۆڤێك یەکسانە بە پلەی هەڵس و کەوت کردنی لەگەڵ دەورو بەری‌دا ئەوەی مەبەستمە لێرەدا بڵێم کە ئەنجامی پێش کەوتن و رزگار بوونی گەلان بەستراوە بە پلەی بیرکردنەوەیان کە گەلێك جار بەهۆی بیری خراپەوە گەل و نەتەوە بەرەو هەڵدێری لە ناوچوون و پەرەکانی مێژوو دەبات.

وە ئەم کردارەش بە شێوەیەکی ئاشکرا لە نێوان نەتەوە پاش کەوتووەکان بەدی دەکرێت وەبەشێوەیەکی بلاویش لەنێوان تاکەکانی نەتەوە چەوساوەکان دا بڵاو کراوەتەوە دیارە ئەمەش گشتی دەگەرێتەوە بۆ جۆرو پلەی بیرکردنەوەیان دەربارەی ئەو تیۆرو پرانسیپانەی کە پێکهاتەی نەتەوەی لێ پێك دێت، ئەویش لەرێگەی تێکەڵ کردن و جیاوازی نەکردنیان بۆ ئەو ماناو مەبەستانەی کەئەم تیۆرو پرانسیپانە بۆی دامەزراوون.

## کۆمەڵگای نموونەیی

بۆ نموونە جیاوازی ناکەن لەنێوان (سەربەخۆیی، ئازادی) (وڵات و سەرۆك وڵات) (دادگاو دادوەر)....هتد.

کەپێویستە تێکەڵ بەیەکتری نەکرێن لەبەرئەوەی هەر مەفهومێکیان مانایەکی تایبەتی و کارێکی جیاوازی هەیە لەوانە تێکەڵ کردن و جیاوازی نەکردن لەنێوان مانای سەربەخۆییو ئازادی کار دەکاتە سەر پێکهاتەی گەڵ لەرێگەی سەر لێشوانی نەتەوە بۆ ئەم دوو زاراوە لەبەرئەوەی سەربەخۆییو ئازادی دوومانای جیاوازیان هەیە وەلە هەموو کاتێك دا پەیوەست نین بەیەکەوە وەنموونەش بۆ ئەم کردارەو بۆچوونەمان دا گەلێك زۆرەو لەژمار نایێت بەتایبەتی لەوڵاتە دراو سێیەکانماندا کە بەشێوەیەکی روون و دیار دەبینێت کەدانیشتوان و پێکهاتەی ئەم گەلانە هەست بەهیچ جۆرێك لە ئازادی ناکەن بەتایبەتی لەرووی ئازادی بیروراو ئازادی وڵاتەکەیان لەدەرکردنی یاساو بریارەکانیدا ئەگەر چی سەر بەخۆیشیان بەدەست هێناوە بەمانای ئەوەی مەرج نییە سەربەخۆیی ئازادی لەگەڵ دابێت بەهەمان شێوە لە مەفهومی دادگاو دادوەر نەگەیشتوون وتێکەڵ بەیەکتری دەکەن بەڵکو لەلای ئەوان دادوەر بەمانای دادگا دێت بەجۆرێك هەر کاتێك زۆردایو ستەمێك رووبدات لەلایەن دادەوردا دەیلکێنن بەپلەی یەکسانی و دادپەروەری یاساو بریارەکانی دادگاوە، ئەمەش بەخراپترین کردار دەژمێردرێت لەرووی بڕواو متمانە کردن بە بڕیارەکانی دادگاوە لەبەر ئەوەی بۆی هەیە دادوەرێك زۆردار بێ و نایەکسانییەك بکات لە کاتی دەرکردنی بڕیارەکانیدا بەلام ئەم کردارە واناگەیێنێت وە بە هیچ شێوەیەك کە دادگا زۆردارە وستەم دەکات بە مانای ئەوەی نابێت بە پەلەو یەکسەر بڕیار لەسەر نەبوونی دادپەروەری بڕیارەکانی دادگا بدەین لەبەر ئەوەی لە هەموو وڵاتێك دا دادگا نیشانەی یەکسانی و دادپەروەرییە وە بەستراوە بە پلەی پێشکەوتنی رۆشنبیری ئەم وڵاتە.

**کۆمەڵگای نموونەیی**

نمونـەی سـێیەم ســـەبارەت بــە جیــاوازی نەکردنیانـــە بــۆ سیســـتەمی وولاٌت وە بەستنەوەو جیاوازی نەکردنی لەگەڵ تیۆری سەرۆك وولاٌت کە سەیر دەکەیت لــەلای گەلێك نەتەوەدا کە ناوی سەرۆك وولاٌت دێت یەکسەر دەیلکێنـن بـە وولاٌتەکەیـەوەو لـە هـەموو روانگەیەکـەوە سـەیری ئـەم وولاٌتانـــە دەکــەن و دەبیـنـون لــە رێگــەی سەیرکردنیان بۆ ســەرۆك وولاٌتەکەیان (هەرچـەندە ناهـەقیان نـاگرم لەبـەر ئـەوەی دەبێـت سـەرۆك وولاٌت نوێنـەری گـەل بێـت بـە هـەموو مانایەکـەوە جگــە لــە مانــا یاسایی‌یەکەی) بەلاٌم ئەم کردارەش پێچەوانەی گشت یاساو تیۆرە کۆمەلاٌیەتیەکانە لەبەر ئەوەی بۆی هەیە نەتەوە پێش کـەوتوو خـواز بێـت وەمامەڵـە کردنـی لەگـەڵ دەوروبەری‌دا چاك و بەسوود بێت بەلاٌم ســەرۆکی وولاٌت بـەپـێی داواو بۆچونـەکانی داگیرکـەران هـەڵس و کـەوت بکات بـە مانـای ئـەوەی چلکـاو خـۆرو ژێـر دەسـتەی وولاٌتانی بێگانەو داگیرکەرانە ئەمە لەلایەك لەلایەکی تردا گشت کردارو پێکهاتەکانی گـەل دەبەسـتنەوە بەسـەرۆك دەوڵـەوت وەهـەردەم بیرلەوەدەکەنـەوە و پرســـیار دەکەن ئایا سەرۆك دەوڵەت چی ئەنجام دەدات بۆ وولاٌتەکەیان؟ بەبێ ئـەوەی بـیر لەوە بکەنەوە ئاخۆ ئەوان چی دەکەن و چـی ئـەنجام دەدەن لـەپێناو وولاٌتەکەیان لەهەمان کاتدا سەرۆك وولاٌت بەبەرپرسیار دەزانن لەهەموو کارو کردەوەیەك داجا چ گـەوەر چ بچـوك بێـت بـەبێ ئـەوەی بـیر لەوەبکەنـەوە کـە ئـەم وولاٌتـــە لەســەر چ جۆرەسیستەمێك کاردەکـات کەبـەگوێرەی ئـەم سیسـتەمە هـەمووکارەکان دابـەش کراون بەجۆرێك (تدرج) هەیە لەبەر پرسیاریەتی لەکارەکانی وولاٌتدا.

جگەلەمانەش گەلێك زارەوەو دروشم تێکـەڵ بەیـەکتری دەکرێـن بەتایبـەتی تێکـەڵ کردن و جیاوازی نەکردنیانە بۆ مانـاو مەبەسـتی دیموکراسـی لەگـەڵ ئـازادی رەهـا (ئازادی کارو هەڵس و کەوت کردن) تێنەگەیشـتن و هـەرس نـەکردنی ئـەم زاراوەیـە بەشێوەیەکی بـاش لەنەخۆشـی‌یە ترسـناك و لـەناو بـەرەکانی وولاٌتـە دیموکراســی

خوازەکان دەژمێردرێت کەگەلێك جار دەبێتە هۆی کەم بوونەوەو لەناوچوونی ئەم جۆرە کەمۆیەکەی دەگەرێتەوە بۆ ئەو سیستەمانە بە جۆری بیرکردنەوەو رادەی تێگەیشتنی تاکەکانی ئەم سیستەمە.

لەبەر ئەوە پێویستە وەبەگرنگی دەزانم وەکو پرۆگرامێك جۆرێك لەووشیار کردنەوەی کۆمەلایەتیو رامیاری (سیاسی) بلاوبکرێتەوە لەرێگەی تێرکردنێکی هێواشی لەهۆشمەندیتی وەلە رێگەی دووکرداری سەرەکی دەتوانین گەل بگات بەم مەبەستە:

**یەکەم:** بەداهێنان بەرەیەکی نەتەوەیی.

**دووەم:** لەرێگەی مامۆستاو قوتابخانەدا.

## یەکەم: داهێنانی بەرەیەکی نەتەوەیی:

هەموو نەتەوەیەك دەتوانێت یەکێتی رێزەکانی مسۆگەر بکات ئەگەر بێت و بتوانێ بەرەیەکی نەتەوەیی بێك بهێنێت بەمەرجێك گشت پێکهاتەکانی ئەم نەتەوەیە بگرێتە خۆی، کە ئەم کردارەش بە کارێکی زۆر گرنگ دادەنرێت بەتایبەتی لەناو نەتەوە ژێر دەست و بەش کراوەکان دا لەبەر ئەوەی بەرەی نەتەوەیی بەمەلّبەندی هێز دادەنرێت کەلەرێگەیەوە دەتوانرێت بەرنگاری دوژمنەکان وگشت پیلانە چەوسەواکانیان ببنەوە لەو وولاتانەی کەبەبەردەوامی دروشمی زۆرداری وستەمیان بەزرکردۆتەوە.

هێلیکاریو شێوەی ئەم بەرەیە دەبێت بەشێوەیەك پێك بهێنرێت کەگشت پلەوجۆرەکانی نەتەوە بەشداری تیادا بکەن بەبەشداری کردنی هەر یەکێکیان بەنوێنەرێك کەلەنێوان خۆیان دا دەیپالێون بۆ ئەم کردارە وەئەمەش پێویستی بەکۆکردنەوەو رێکخستنێکی تایبەتی هەیە لەلای ئەم بەشانەدا لەشێوەی یەکێتی

یەك یاخود كۆمەلەیێك...هتد، بەمەرجێك ئەم رێخكستنە سەرتاسەری نەتەوە بگرێتەوە نەك تەنها ئەندامانی یەك وولات بگرێتە خۆی لەبەر ئەوەی بۆی هەیە نەتەوەیەك بەچەند وولاتێك بەرچاو كەوێت یاخود لەنێوان چەند وولاتێك دا دابەش كرابێت.

وەبەم شێوەیە دەتوانین بڵێین بەرەی نەتەوەیی هێزێكە پێك دێت لەنوێنەرانی گشت پێكهاتەكانی نەتەوە (لەرێكخراوە جەماوەریو پیشەییەكان و پارت و رێكخراوە سیاسییەكان لەپاڵ رێكخستنە زانستی وووێژەییو رۆشنبیریەكان دا)، بۆ نموونە (یەكێتی زانایان، یەكێتی ئافرەتان، سەندیكای كرێكاران، پیاوانی كار، پاریزەران) جگە لەمانەش پیویستە پارت و رێكخراوە سیاسییەكان تەنها بەنوێنەرێك بەشداری بكەن بەمانای ئەوە پێویست بەبەرەیەكی نیشتمانی دەكات كە ئەم پارت ورێكخراوانە دروستی بكەن لەنێوان خۆیان دا بەمەبەستی بەشداری كردن لەبەرەی نەتەوەییدا.

وەبەم كردارەش دەتوانرێت پارێزگاری لەیەكێتی رێزی نەتەوە بكرێت دوور لە خەون و حەزی هەندێك لەدەسەلاتداران كەبەهۆی پیلانی داگیر كەران هەڵسو كەوت لەگەڵ ریزەكانی گەل دەكەن.

جگە لەمەش كۆكردنەوەی گشت پێكهاتەكانی نەتەوە دەبێە هۆی داهێنانی هێزێكی بێ شوومار لە هەموو لایەنێكی ژیان دا كە بە هۆیەوە دەتوانرێت گشت ئامانج و مەبەستەكانی نەتەوە ئاراستە بكرێت بەرەو پێش كەوتن و نوێ بوونەوە وە لەهەمان كات دا دەبێتە هۆی بنیات نان و ئەفراندنی عەقڵێكی سیاسی كە لە پاڵ سیاسەتێكی كراوەی بریار بەدەست دێتەكایەوە كە تیایدا بریارەكان بە زۆرینەی دەنگ دەردەچێت ئەوەش خۆی لە خۆیدا جێگای متمانەو باوەر پێكردنە كەوەكو ئاوێنەیەك كێش و پلەی دەست لاتی نەتەوەیی دیاری دەكات وە دەبێت

بڕیارەکانی لەسەر رووی بڕیارەکانی وولآت بێت سەبارەت بەو بڕیارانەی کە کـار لـە ڕیزی نەتەوە دەکەن وە ئەبنە ڕێگرێك لە کامڵ بوونی بەرەی نەتەوەیی ئەوەیش لە ڕێگای چارەسەرکردنی بە نزیك بوونی گشت پێکهاتەکانی نەتەوەو هەوڵ دانیان بۆ داهێنانی جۆرە لێبوردنێك لە مامەڵە کردن لەگەڵ بنـەما نـاوەکی و دەرەکیـیەکانی بەرەوی نەتەوەییدا بەمەش گشت پێکهاتەکانی نەتەوە هەوڵ دەدەن کە یەك بگرن بۆ بەشداری بوونیان لە بـەرەی نەتـەوییدا وە ئـەم کردارەش هەرچـەندە زۆر جـار دەبێتە هۆی زیاتر کردنی ژمارەی نوێنەرەکانی بەلآم لە هەمان کات دا دەبێتە هۆی پتەوتر کردنـی یـەکێتی خـاکی نەتـەوە بـە مانـای پارێزگاری لـە یـەکێتی گـەل و نیشتمان دەکات لە هەموو بوارێك دا (رۆشنبیری ، ئـابووری ، کۆمەلآیـەتی .. هتـد) لە ڕێگەی کۆکردنەوەی بۆ گشت هێزو بیری پێکاهتەکانی نەتـەوەدا بۆیە پێویستە لەسەر گشت نەتەوەیـەك هـەوڵ بـدات بۆ داهێنـانی بەرەیـەکی نەتـەوەیی بەسـوود وەرگرتن لە تەجروبە بایەخدارەکانی گشت سیسـتەمەکانی جیهان دوور لـە هـەموو مەبەستێکی تەسکی حزبایەتی و چینایەتیدا.

## دووەم: لە ڕێگەی مامۆستاو قوتابخانەدا:

مامۆستایان بەهۆی ئەو ئەرکـە پـیرۆزەی کـە پـێی هەڵدەسـتن دەتوانن دەورێکـی بەرزو باڵا بگێرن لە گۆڕینی نەتەوەو کۆمەڵ دا بۆیە پێویستە لـە سـەر مامۆسـتایان کە بیرۆکەی ئازادی و یەکسانی بڵاوبکەنـەوە لـە نێوان قوتابیـەکانیاندا بـە جۆرێك بەردەوامی و گۆڕان بکەن بە دروشم و مەبەستیان.

لەبەر ئەوەی قوتابیانی ئینجا لـە هـەر پلەیـەك دا بن (لـە قۆنـاغی سـەرەتاییەوە تاوەکو (دکتۆراە) لە هەوڵدانێکی بێ شومارو نەوەستاوە دایە بۆ چـاو لێکردنـەوەی مامۆستایەکەی (ئەم کردارەش بە پلەی ٩٠٪ لـە نـاو قوتابیـان بـەدی دەکرێت) لـە ڕێگەی بەدواکەوتن و ڕێکخستنی بیرو بۆچونـەکانیان بـە شـێوەیەك کـە بگونجێت

لەگەڵ بیرو رای مامۆستاکانیان وە لە هەندێك کات دا سەیردەکەی بیرو بۆچونەکانی قوتابی جۆررێکە یاخود درێژکردنەوەیێکی رێرەوی مامۆستاکەیەتی.
جگە لە مامۆستا قوتابخانەش دەتوانێت دەورێکی باش ببینێت لە پەروەردەکردنی بیرۆکەی بەرەی نەتوەیی‌دا ئەویش لە رێگەی داهێنانی وانەیێکی هەفتانە لە پاڵ وانەکانی تری قوتابخانەدا کە تیایدا بنەماکانی بەرەی نەتەوەیی بخوێندرێت بە جۆرێك گشت ئەو بنچینانەی تیاد کۆبکرێتەوە کە بە هۆیەوە ئەم قوتابیانە بتوانن پارێزگاری لە یەکێتی گەل و نیشتمان بکەن دوور لە هەر مەفهوم و سیستەمێکی جیهانی ئەم کردارەش دەبێتە هۆی بەرزکردنەوەی پلەی رۆشنبیری رۆڵەکانی ئەم گەلانە بە جۆرێك سیستەم و پیلانی داگیرکەران بشکێنن کە هەردەم هەوڵ دەدەن بە هۆی چەند یاسایێکی دارژاو بۆ ئەوەی رۆڵەکانی ئەم گەلە لێك بکەن و جۆرە دووبەرکیەك لە نێوانیان بهێننەوە.

## ((بنەماکانی یەکگرتن))

یەکگرتن وەکو هەر بنچینەیەکی کۆمەلأیەتی دەسەلأتێکە پشت دەبەستێت بەچەند بنەمایێك کەلەرێگایەوە هەڵدەستێت بەکرداری رێکخستنی کۆمەڵ بە ئومێدو مەبەستی دروست کردن و داهێنانی کۆمەڵگایێکی نمونەیی ئەویش لە رێگای بەستنەوەی ئەم بنەمایانە بە رەوشت و داوایە ئاینیەکان واتە ئەم بنەمایانە لە قورئانی پیرۆزدا داواکراوەو باسی لێکراوە بۆیە پێویستە لەسەر باوەرداران کە رێنمایی بکەن و پارێزگاری لە داواکاریەئاینیشی بکەن.
لە هەمان کات دا پێویستە لەسەر ئەو یاساو سیستەمانەی کە هەڵدەستن بە کرداری رێکخستنی ژیانی کۆمەڵ و ئادەمیزاد کە بگونجێن لەگەڵ یاساو سیستەمە

ئاینیەکان بەمانای ئەوەی کەهاوشێوەبن لەگەڵیدا لەبەر ئەوەی یاساو داوایە ئاینیەکان لەگەڵ سروشتی ئادەمیزاد دەگونجێت کە لە ڕێگایەوە دەتوانرێت (کۆمەڵگایك) پێك بهێندرێت بەپشت بەستن بەو سیستەم داب و نەریتانەی کە لە گەڵیدا هاتوون وە ئەم بنەمایانەش پێك دێت (یەکسانی ، دادوەری ، هەرەوەزی (هاوکاری) ، لێبوردەیی ، مافی یاسا دانان)

**١- یەکسانی ( المساواه )**

ئەگەر سەیری پەیامی موسڵمانیەتی بکەین سەبارەت بەیەکسانی دەبینین زۆر بەتوندیو بەشێوەی واجب داوای یەکسانی دەکات لەنێوان چین و توێژەکانی کۆمەڵ دا بەشێوەیەك کە پارێزگاری لەیەکێتی ریزەکانی گەل دەکات لەهەموو سات و کاتێك دا.

بۆ ئەم مەبەستەش دوورێگەی گرتۆتەبەر یەکەمیان یەکسانی گشت چین و توێژەکانی کۆمەڵ بەرامبەر بەیاسا دووەمیان داوای یەکسانی کردووە لەمافەگشتیەکان بەتایبەتی لەمافە رامیاریەکان دا (السیاسی).

یەکسانیەك کەهیچ جیاوازی یەك نیە لەنێوان پێست سپیو پێست ڕەش، لەنێوان دەوڵەمەندو هەژار لەنێوان خاوەن دەست هەلات و بێ دەست هەلات دا بەجۆرێك کە سیستەمی چینایەتی لەناو کۆمەڵ هەڵگیرێت و لەناو بردرێت کە خودای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت:

﴿یاایها الناس اناخلقناکم من ذکر وانثی﴾ الحجرات: ١٣

لەم ئایەتەدا خودای گەورە داوا لەگشت کۆمەڵی ئادەمیزاد دەکات وبیریان دەکاتەوە بەسەر چاوەی دروست بوونیان کەهەموویان لەیەك نێرو مێ لەدایك بوونە وەهیچ پێویست ناکات کەهەندێکیان خۆیان بەگەورەترو بەرزتر بزانن لەهەندێکی

تردا بەبیانوی ڕەگەز ورەنگ لەبەر ئەوەی ئەمانە گشتی بەهۆی باری سترووشتی یە وە ڕوودەدات و مرۆڤ هیچ دەورێکی تیادا نابینێت بەڵکو دەبێت ئادەمیزاد یەکتری بناسن و بزانن ئەمانە لەیەك دایك و باووك پەیدا بوونەو ناسینیش دەبێتە هۆی یارمەتی دانی یەکتری لەکاروباری ڕۆژانەدا بەشێوەیەك کەجۆرێك لەخوشك وبرایەتی لەنێوانیان دروست ببێت کە خودای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت

﴿وجعلناكم شعوباً وقبائل لتعارفوا ان اكرمكم عندالله اتقاكم﴾ الحجرات: ١٣

وە پێغمبەرمان (ﷺ) لەئاخر خوتبەیدا داوای یەکسانی کردوە کەدەفەرموێت **(يا ايها الناس ان ربكم واحد، وان اباكم واحد، كلكم لادم وادم من تراب، اكرمكم عندالله اتقاكم، وليس لعربي على اعجمي، ولا لاعجمي على اعربي، ولأحمر علـى ابيض، ولا لأبيض على احمر فضل الا بالتقوى)**

کەواتە پەیامی مرۆڤایەتی داوای یەکسانی دەکات یەکسانیەك کەدەنگی فەرماندەری تیادا وون دەبێت کە هەردەم خۆیان بەبەرزترو زلتر دەزانن لەکۆمەڵ یەکسانی یەك کە هیچ مافێك نادات بەشازادو شالیارەکان (الامراء و والوزراء) کە دادگایەکی جیاوازیان هەبێت لەدادگای گەل بەڵکو دەبێت هەموو چینەکانی کۆمەڵ بەرامبەر بەیەك دادگا بوەستن و ماف و داواکانیان لێ وەربگیرێت و بۆ شیان ور بگیرێت وبەشێوەیەکی یەکسانی بەڵێ ئەو سیستەمە ڕێگانادات تەنها بەسەرۆك دەوڵەتیش کەمافێکی زیاتری هەبێت لەدادگا کردن یاخود لەسامان کۆکردنەوە بەرامبەر بە خەڵکانیتری کۆمەڵدا.

مرۆڤ کە بەقووڵای سەیری ئەم ڕێرەوەو ئەم باسەدەکات دەبینین گشت ئەم داوایانە کاردەکەن بۆمانەوەی کۆمەڵ و گەل بەشێوەیەکی یەکگرتوو بەجۆرێك هیچ هۆکارێك کاری تیادا ناکات بۆ لێك ترازانیان بەتایبەتی خۆشەویستی دەست هەڵات

و خاوەنداری کە بە یەکێك لەنەخۆشیەکانی گەل دەژمێردرێت و گەلان لەهەموو کاتێك دا پێ یەوە دەنالێنن.

**٢- دادپەروەری:**

مانای دادپەروەری بریتی یە لە رەچاوکردنی مافی ئادەمیزاد لە هەموو بوارێك دا لە کاتی دانان و دارشتنی یاساکان دا.

بەپێی ئەم پێناسەیە پێویستە لەسەر گەلان ماف و پێداویستیەکانی ئادەمیزاد رەچاوبکەن و لەدەستووری وولات دا مافی گشتی یان دیاری بکرێن و بەچاوی کەمە نەتەوایەتی سەیری هیچ کۆمەڵێك نەکرێت بەڵکو گشتی یان بەیەك چاو دەبێت سەیر بکرێت و ئازادی بیرورا یەکێك بێت لەبنچینەکانی گەل لەبەر ئەوەی هەرچەندە ئەم بیرو رای جیاوازە بەڵام گشتی بۆیەك ئامانج و ئاوات کاردەکات بە شێوەیەك کە هەریەکەیان بەپێی بیروڕای خۆی بەرێگایەکی جیاواز هەوڵ دەدات بگات بەو ئاوات وئامانجە ئەمەش رێگە لەلایەنەکەی تر ناگرێت کە بەپێی بیرو رای خۆی بکەوێتە رێگا بۆ گەیشتن بە ئامانج و ئاواتەکانی.

وەلەبەر گرنگی دادپەروەری لەژیانی گەلان دا بەتایبەتی بۆ پاراستنی یەکێتی گەل خودای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا بۆمانی روون کردۆتەوە کەمەبەست لەناردنی پێغەمبەران بەشێوەیەکی گشتی بۆ بڵاوکردنەوەو داهێنانی سیستەمی دادپەروەری کۆمەلایەتی بوو لەنێوان ئەم گەلانەدا کە دەفەرموێت: ﴿لقد ارسلنا رسلنا بالبينات وانزلنا معهم الكتاب والميزان ليقوم الناس بالقسط﴾ الحديد: ٢٥

کەواتە لەرەوەشتە بەرزەکانی مرۆڤی باوەڕدار پێویستە دادپەروەر بێت لەکاتی ئەنجام دانی کارو باری رۆژانەی لەگەڵ خەڵك دا بەشێوەیەك لەکاتی ئەنجام دانی کارەکانی دا هەموو توانای بخاتە کار بۆ خزمەت کردنی چین و توێژەکانی کۆمەڵ و

بەیەک چاوو یەک پلە سەیری گشتیان بکات کـە لـەقورئانی پـیرۆزیدا دەفـەرموویت:

﴿یاایها الذین امنوا کونوا قوامین بالقسط شهداء لله ولو علی انفسکم او الوالدین و الاقربین﴾ النساء: ١٣٥

پەیامی مرۆڤایەتی بەمەش نەوەستا بەڵکو لە بەرزترین پلەی دادپەروەری دا خۆی دەگرێت ئەویش لـەکاتێک کـەداوا لـەباوەڕداران دەکـات کـەئاداگاری و پارێزگـاری لەبنچینەکانی داد پەروەری بکەن بەشێوەیەک لەکاتی هەڵسـوکەوت کـردن لەگـەڵ دوژمنیـش دا ڕاچـاوی دادپـەروەری بکـە کەلـەقورئانی پـیرۆزدا دەرفـەرموێت:

﴿ولایجرمنکم شنان قوم علی الا تعدلوا اعدلوا هو اقرب للتقوی واتقو الله ان الله خبیر بما تعلمون﴾ المائدة: ٨

واتە رەق وکینە لەگەڵ گەلێک داواتان لێ نـەکات کـەداد پـەروەری بـەجێ نەگـەیەنن بەڵکو داد پەروەبن لەبەرەئەوەی دادپەروەری نزیکە لەتەقوای خودای گەورە.

جگە لەمە خودای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا لەزۆر جێگادا داوای دادپەوەری کردووە و پلـەی داد پـەروەری بـەرز کردۆتـەوە و بـۆ بـەرزترین پلـەی مرۆڤایـەتی کـەدە فەرموێت: ﴿واذا قلتم فاعدلوا ولو کان ذا قربی﴾ انعام: ١٥٢ ، هەروەها سەبارەت بەداد کردنی خەڵک داد پەرەوری بەسەرچاوەی داد کـردن دێت لەبەرئـەوەی وەکـو لەمەوپێش باسمـان کـرد کەپێویسـتە یاسـاکانی بەشـێوەیەک داپڕێژرێـت کـە دادپەروەری تیـادا رەچـاو بکرێت وەهـەر یاسایەک کەداد پـەروەری تیادا رەچاو نەکرێت دەبێتە هۆی دامێنانی تەنگێشەو ئاژاوە لـەنێوان کۆمـەڵ داو بـاری ئاسـایی گەڵ تێک دەدات بۆیە پێویستە لەسەر (حاکم) لـەکاتی دەرکردنـی فـەرمان و حوکم دادپەروەری رەچاو بکات کە خـودای گـەورە لەیـەکێک لـەداواکانیدا دەفـەرموێت:

﴿واذا حکمتم بین الناس ان تحکموا بالعدل﴾ النساء: ٥٨

ئەمەش خۆی لەخۆی دا وادەگەیەنێت کەئازادی بیرورا یەکێکە لەمەبەستەکانی ئەم کۆمەڵە وە پێویستە پارێزگاری لێ بکرێت لەبەرئەوە بەئازادی بیرورا دەتوانرێت زیاتر پارێزگاری لەیەکگرتن بکرێت بەجۆرێك لە زمانی لەیەك گەیشتن و گۆڕینەوەی بیرورا مەبەست بێت نەك بکا رهێنانی چەك و ئازاردان.

٣- لێبوردەیی:

لێبوردەی لەرەوشتە بەرزەکانی ئادەمیزادە لەبەرئەوەی لەناخی دڵ و دەروونی مرۆڤ دەردەچێت بەخۆگرتن ودڵی خۆش بوونی لەسەر دەست درێژ کردن و ئازار دانی کەسانی تر بۆی بۆیەش ئەم رەوشتە بەرزە بەیەکێك لەبنەماکانی یەکگرتن دادەنرێت ئەویش بەهۆی سەلماندنی کردارەکانی رۆژانە کەبە لێبوردن و بەوەلام دانەوەی خراپە بەشێوەیەکی چاك والەبەرامبەر دەکات کەزیاتر لەو مرۆڤە نزیك بێتەوەو رێزی لێ بگرێت بەشێوەیەك کەجۆرێك لە پشتیوانی و هاوکاری لەنێوانیان دێتە کایەوە ئەمەش یەکێك بوو لەداواکاریەکانی خودای گەورە لەزۆر جێگا بەسەر باوەرداران دا کەئەم رێگایە بگرنەبەر لەکاتی هەڵس و کەوتی رۆژانەیدا لەگەڵ کەسانی تری کۆمەڵو لەکاتی رێکخستنی پەیوەندیەکانیان یان لەگەڵ خەڵکانی تردا کەدەفەرموێت:

﴿وإن تعفوا وتصفحوا وتغفروا فان الله غفور رحيم﴾ التغابن: ١٤

هەروەها لەکاتی باس کردنی رەوشتە ئاینیەکانی مرۆڤی بەباوەر دەفەرموێت:﴿ويدرؤون بالحسنة السيئة﴾ الرعد:٢

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ولاتستوي الحسنة ولاالسيئة ادفع بالتي هي احسن فاذا الذي بينك وبينه عداوة كأنه ولي حميم﴾ فصلت: ٣٤

لەم ئایەتە پیرۆزەدا بۆمان ڕوون دەبێتەوە  کە لێبوردەیی وچاکە کردن لەگەڵ خەڵك دا دەبێتە هۆی داماڵینی‌و لابردنــی دووبــەرەکی ورەق وکینــە لــەدڵ و دەروونیــان دا بەشێوەیەك کەدەبێتە هۆی داهێنانی جۆرێك لــەهاوکاری و برایــەتی کەڕێگــە خۆش دەکات بۆ یەکگرتن و لێك نزیك بوونەوەی ئەم دوولایەنە لەدوارۆژدا.

٤- **هەرەوەزی:** بۆ بەرزکردنەوەی ژیانی کۆمەڵ بەشێوەیەکی پێــش کەوتوانە و زانستانە بەرەو بــەرزترین پلــە پێویستــە  هــەرەوەزی و یارمــەتی‌دانی یــەکتری بکرێــت لــەکاروباری ڕۆژانەو باری ژیاندا.

لەبەر ئەوە پێویستە ڕۆلەکانی گەل پێ بگەیێندرێت لەسەر هەستی خۆشی هەرەوەزی وهاوکـاری دا بەشـێوەیەك لەگـەڵ یـەکتری‌دا بەیـەك دەسـت وبەیــەك دڵ هاوکــاری یــەکتری بکــەن لەبەرئــەوەی بەهــەرەوەزیو یارمــەتی یــەکتری دەتوانرێــت لــەدوو لایەنەوەسـوود بەکۆمـەڵ بگەیـەنرێت یەکـەمیان هـەرەوەزی بەیـەکێك لەبنــەماکانی یەکگرتن دادەنرێت ئەویش لەڕێگای کۆکردنەوەی ڕۆلەکانی کۆمەڵە لەسەر یەك کارو یــەك مەبەسـت دا ئەمــەش لــەلای کــەس وون نیـیــەو ئاشــکرایە کــە کۆمەڵــە هەرەوەرزی‌یــەکان چ سـوودێك دەگەیـەنێت بەکۆمـەڵ و خــاك دا چ لەلایــەن بــاری ئابووری و چ لەلایەن بـاری پـەیوەندی کۆمەلایـەتی‌دا دووەم سـوودی هـەرەوەزی و یارمەتی یەکتر دان لە کارگەو کاری ڕۆژانــە بــەدی دەکرێـت کــە بــەهۆی هــەرەوەزی دەتوانرێـت پلـەی بەرهـەم بەرزبکرێتـەوەو بـاری داهــاتی گشـتی چــاك بکرێــت و کۆبکرێتەوە بەمەش باری ئابووری گەل باش دەبێت  وە جۆرێك  لــە ئارامی لــەبازار دروست دەبێت کەلەڕێگەیەوە کۆمەڵ هــەوڵ دەدات بـۆ کرانــەوەو پێش کــەوتن بـۆ گەیشتن بە وولاتــە پێش کــەوتووەکان لەڕێگــەی پــەیوەندی کردنــی بــەم وولاتــەوە بەسـوود وەرگـتن لـە بـیرو زانیـاری ڕۆلـەکانی کەلـەم وولاتانـەدا زانست و زانیــاری

کۆدەکەنەوە و لەنیشتمانلدا جێ بەجێی دەکەن بەهەرەوەزی لەگەڵ رۆڵەکانی تری کۆمەڵ.

**٥- مافی یاسادانان**

لەو پێویستانەی کەرێگە خۆش کەرن بەرەو یەکگرتن دامالینی مافی یاسا دانانە لەلایەن مرۆڤەوەو گەرانەوەیەتی بەرەو یاسا وداواکاریەکانی خودای گەورە بەجۆرێك رێگە نەدرێت بەهیچ کۆمەڵ و کەسێك کەدەست هەلات ومافیان زیاتر هەبێت بەرامبەر بەکەسانی تردا لەرێگەی گۆرین و داهێنانی یاسای جۆراو جۆر بەپێی هەوەسی خۆیان بەپێی رەچاو کردنی هیچ بنچینەیەکی کۆمەلایەتی و ئاینی.

واتە لەم کۆمەڵەدا هیچ کەسێك بەرزترنییە لە یەکێکیتر بەلکو دەست هەلات گشتی دەگەرێتەوە بۆ خودای گەورە وەپێویستە لەسەر داهێنەرانی یاسا بەپێی پەیامی خودای گەورەیاسا دابرێژن ولەسنووری داواکاریەکانی کۆمەڵ دەرنەچن بەمەش گشت چین و توێژەکانی کۆمەڵ لەو کەسانەی کەباوەریان بەپەیامی خودای گەورە هەیە هەست بەیەکسانی ئەم یاساو داواکاریانە دەکەن لەرێگەی هەست کردنیان بەداد پەروەریەتی یاسا گشتیەکانی خودای گەورە بەجۆرێك لەکاتی جێبەجێ کردنی ئەم یاساو داواکاریانەدا واهەست دەکەن کەرێنمای پەیام و داواکاریەکانی خودای گەورە دەکەن بەشێوەیەك کەهیچ کەس دەست هەلاتی نییە لەسەریان دا وە گشت یەکسانن لەبرامبەر یاسای خودای گەورەدا ئەمەش زیاتر رێگە ئاسان دەکات بۆ نزیك بوونەوەی گشت چین و توێژەکانی کۆمەڵ لەیەکتری.

## رۆلی ئافرەت لەیەکگرتن دا:

لەبەرئەوەی ئافرەت نیوەی کۆمەڵ پێك دێنیت بۆیە پێویستە ئیش بکات و لەکار کردن نەوەستێت وە بەردەوام بێت شان بەشانی پیاو بۆ رێکخستن و بەرەو پێش بردنی کۆمەڵ دا لەبەر ئەوەی بەهۆی ئەو سۆزو بەزەیی‌یەی کەئافرەت هەیەتی دەتوانێت بەگەورەترین و بەرزترین کرداری پەروەردەو بنیات نان هەڵبستێت لەوولات دا بەڵکو ئافرەت دەتوانێت دەستێکی بالای هەبێت لەگۆرینی رێرەوی کۆمەڵ لەرێگەی پەروەردەکردنی منالەکانی بەو شێوەیەی کە نەخشەیان بۆ دەکێشێت وە بەپێی هەوەسی خۆی ئاراستە یان بکات بەرەو ئەو رێگایەی کە خۆی مەبەستێتی زیاتر لەپیاو.

بەلێ ئافرەت دەتوانی کۆمەڵ بەرەو یەککگرتن و یەکێتی ببات و بەردی بناغەی گەل دابنێت لەرێگەی پەروەردەکردنی منالەکانی لەسەر خۆشەویستی و تەبایی کەیەکێتی گەل بکات بەنموونەی گەورە بۆ خەیاڵ و بیریان بە جۆرێك گیانی پێش کەوتنیان لەدلْ دا بروێنێت و داوایان لیْ بکات کەلە دوا رۆژدا کارو کردەوەکانیان بەم شێوەیە ئاراستە بکەن وەبەمەبەستی پاراستنی یەکێتی رێزی گەل و کۆمەڵ بەتایبەتی مافی ئافرەت خودای گەورە و میهرەبان لە قورئانی پیرۆزدا تیشك دەخاتە سەر مافە مرۆڤایەتی‌یەکانی ئافرەت وبەدیاری دەخات و روونی دەکاتەوە بۆ گشت باوەرداارن لەوێنەی یاسایێك کەبەهیچ جۆرێك گەرانەوەو پاش گەزبوونەوەی تیادا نی‌یەوە لەهەمان کاتدا داوا لە ئافرەت دەکات کەکردەوەکانی رێك بخات و لەکار کردن بەردەوام بێت لەبەر ئەوەی وەکو پیاو بەشێوەیەکی یەکسان مافی هەیە بەبیْ هیچ رێگرێك و بەربەستێك کە دەفەرموێت: ﴿للرجال نصيب مما اكتسبوا ولنساء نصيب مما اكتسبن﴾ النساء: ٣٢

بەهۆی ئەو رۆڵەی کەئافرەت دەیگێڕێ لەئاراستە و پێش بردنی کۆمەڵ بەرەو رێرەو رێبازێکی چاك و بەپێز پێویستە لەسەر ئافرەت کە کاربکەن لەسەر رێرەوێکی چاك و رۆڵەکانیان بەرەو ئەم رێرەوە ببەن لەبەر ئەوەی نە خودای گەورەو میهرەبان کاری ئەوان لەیاد دەکات نەمێژووی گەلیش لەیادیان دەکات کەلەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿فأستجاب لهم ربهم انی لا اضیع عمل عامل منکم من ذکر او انثی بعضکم من بعض﴾ آل عمران: ١٩٥

وە بەمەبەستی پارێزگاری کردن و مانەوەی خێزان و کۆمەڵ وەبەمەبەستی بنیات نان وداهێنانی خێزانێکی بەسوود ئافرەت ئازادە لەژیانی خۆی دا بەتایبەتی لەهەلبژاردن و رازی بوونی لەسەر هاو سەری ژیانی دا لەبەر ئەوەی بەزۆر بەشوو کردنی ئافرەت کار دەکاتە سەر ژیانی کۆمەڵ و گەڵ لەرێگەی کار تێکردنی لەسەر خێزان دا بەجۆرێك ئەم ئافرەتە رۆڵەکانی بەشێوەیەکی راست و رەوان ئاراستە ناکات لەبەر هەست کردنی بەکەم و کوری لەژیانیدا و بیر لەمناڵەکانی ناکاتەوە بەو شێوەی کەسوودیان پێ بگەیەنێت و ببنن بەرۆڵەی بەسوود بۆ گەڵ و نیشتمان لەبەر ئەوە پێغەمبەریان (ﷺ) وە بەمەستی پارێزگاری لەمافی ئافرەت و کۆمەڵ دا دەفەرموێت: **(لاتنکح الثیب حتی تستأمر ولا تنکح البکر حتی تستأذن واذنها صمتها)** رواه الشیخان.

لەکۆتای ئەم باسە دا بەهیوای ئەوەین کە ئافرەتان رۆڵی خۆیان لەیاد نەکەن و کاری بۆ بکەن بە ئومێدی پارێزگاری و بەهێز کردنی گەڵ و نەتەوەکەمان رۆڵەکانیان پەروەردەبکەن.

## چەند داب و نەریتێکی کۆمەڵایەتی

پەیامی مرۆڤایەتی لەپێناو بنیات نانی گەلێکی یەکگرتوو بەم بنەمایانە نەوەستاو بەڵکو کاری کردو داوای کرد بۆ بروست کردن وداهێنانی چەند داب و ڕەوشتێکی کۆمەڵایەتی کەلە سایەوەپێویستە رۆلەکانی گەل پێ بگەیەندرێت و هانبدرێن ئەوانیش قسەی چاك و هەوال پرسین و چاك کردنی نێوان خەڵکە.

کەواتە یەکێك لەبنچینەکانی ئەم کۆمەڵگایە داهێنانی چەند داب و نەریتێکی کۆمەلایەتی‌یە کەلەرێگەیەوە دەتوانرێت گشت چین و توێژەکانی کۆمەڵ لەسەردا کۆبکرێنەوە بەجۆرێك کەیارمەتی‌و پیشتی یەکتری بگرن لەپێناو گەیشتن بەئامانجەکانیان بۆیە پێویستە لەسەر مرۆڤەکانی ئەم کۆمەڵە کەریز لەیەکتری بنێنن و لەدوای کەم و کوری‌یەکتری نەگەرێن کەلەقورئانی پیرۆز دا دەفەرموێت

﴿ياأيها الذين امنوا لايسخر قوم من قوم عسى ان يكونوا خيرا منهم ولانساء من نساء عسى ان يكن خيرا منهن ولاتلمزوا انفسكم ولا تنابزوا بالالقاب، بئس الاسم الفسوق بعد الايمان، ومن لم يتب فأولئك هم الظالمون﴾ الحجرات: ١١

### ١- قسەی چاك:

قسەی چاك و باش سەرچاوەی دروست بوون وداهێنانی کۆمەلێکی ڕەوشت بەرزو پێش کەوتوو خوازە بەشێوەیك کەسەر بکەوێت بەسەر گشت ئەو بەربەستانەی کەدێتە پێشیەوە، لەبەر ئەوە سەیردەکەی زۆر لەنووسەرو پەروەردەناسان تیشك دەخەنە سەر ئەم لایەنەوە لەنووسینیان دا ووشەی رێك و پێك بەکار دەهێنن بەجۆرێك دڵ و دەرونی خوێنەر ئاودەدەن بەهۆی ئەو ووشە جوان و بەپێزو پرمانایانەی کەلەباغ و باخچەکانی ووشەی زمان هەڵی دەبژێرن و دەیخەنە ناو نوسینەکانیان.

هەلبژاردنی ووشەی چاك و پڕ لەمانا لەکاتی قسە کردن دا والە ئادەمیزاد دەکات خۆشە ویست بێت لەلایەن دەورووبەریدا بەشێوەیەك وای لێ دەکات کەسەر کەوتوو بێت لەکارو باری داوە ئەنجامی باشیش بەدەست بهێنێت لە ڕێگەی دەست کەوتنی برادەرو هەڤالێکی زۆر کە هەردەم یارمەتی دەدەن لەکاروو بارىدا هەر بەهەمان شێوەو بۆهەمان مەبەست خودای گەورە و میهرەبان لەپەیامی مرۆڤایەتی (قورئانی پیرۆز)دا تیشکی خستۆتە سەر ئەم لایەنەو هانی بەندەکانی دەدات کە قسەو وتەی چاك بکەن و ووشەی چاك هەڵبژێرن لەکاتی قسە کردنیان دا کەدەفەرموێت : ﴿ وقل لعبادي يقولوا التي هي أحسن إن الشيطان ينزغ بينهم﴾ الاسراء: ٥٤

لێرەدا خودای گەورە داوا لەکۆمەڵی باوەڕداران دەکات کە ووشەو قسەی چاك هەڵبژێرن لەگفتو گۆو قسە کردنیان دا ئەگەر وانەکەن ئەهلی مەن نێوانیان تێك دەدات و لەیەکیان دەکات هەربەم پێیە خودای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا باسی پێغەمبەرمان (ﷺ) دەکات کەدەفەرموێت ﴿فبما رحمة الله لنت لهم ولو كنت فظاً غليظ القلب لانفضوا من حولك فاعف عنهم واستغفر لهم وشاورهم في الأمر﴾ ال عمران: ١٥٩

ئەمەش بۆ ڕێپشاندانی باوەڕ داران و سەر کردەکانە بۆ سوودی قسەی چاك و گفتوگۆی باش لەگەڵ کۆمەڵ و تاك دا کە بەهۆی ئەم کردارە دەتوانن کار لەدڵ و دەروونی دەورووبەریان بکەن و بۆ خۆیان ڕایان بکێشن وەبەم پێیەش دەبنە یەك قسەو یەك دەست لە کاڕ کردن بۆ پێش خستنی گەل و لەپارێزگاری وولاتیش دا بەهەمان شێوە بەیەك دەست و بەیەك دڵ پارێزگاری لێ دەکەن.

## ٢- چاك كردنەوەی خەڵك

نزیك كردنەوەو چاك كردنەوەی نێوان خەڵك یەكێكە لەو كردەوە چاكانەی كەپێویستە رۆڵەكانی ئەم كۆمەڵەی لەسەر پەروەردە بكرێت و هان بدرێت بەرەو رواندنی ئەم هەستە لەناو دڵ و دەروونیان دا.

لەبەر ئەوەی ناڕێكی نێوان دووكەس یان دووكۆمەڵ لەوانەیە (بۆی هەیە) پەرەبسەنێ بۆ دووبەرەكی لەنێوان چەندین كەس و چەندین كۆمەڵ دا بەڵكو لەهەندێك جاردا لەنێوان دوو گەلیش وە زیاتر.

بەڵكو لەهەندێك جاردا گەلێك و یەك كۆمەڵ دەبن بەچەند لایەنێك و دوو بەرەكی دەنێتەوە لەنێوانیان دا بەشێوەیەك كە ئازارو زەرەر لە یەكتری دەدەن بۆیە پێویستە لەسەر مرۆڤەكانی ئەم كۆمەڵە كە كاربكەن بۆ چاك كردنەوەی نێوان ئەم كۆمەڵانە بەهۆی ئەو رەوشتە بەرزەی كەلە هەست و دەروونیان چاندراوە وەئەم كارەش تەنها لەو جۆرە كەسانە بەدی دەكرێت كەكەسانێ تریان خۆش دەوێت.

وەكاری چاكیان بۆ دەخوازن وەك چۆن بۆخۆیان ئارەزووی كاری چاكن و چۆن حەز لە بوونی ئاسایش و ئارامی دەكەن بەهەمان شێوە بۆ خەڵكانیش داوادەكەن وە ئەم كارەش خۆی لەخۆیدا واله خەڵك دەكات كەیەك بگرن وپشتی یەكتر بگرن وەك برایان وەئەم كردارەش یەكێكە لەداوا ئایینییەكان كەخودای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿إنما المؤمنون اخوة فأصلحوا بين اخويكم واتقوا الله لعلكم ترحمون﴾ الحجرات: ١٠

بەهەمان شێوە نەهێشتن و داماڵینی شەرو تەنگێشە لەنێوان دوو كۆمەڵ یاخوود دوو گەل لەواجبەكانی رۆڵەی ئەم كۆمەڵە یە كەپێویستە كاری بۆ بكەن بۆ هێشتنەوەی برایەتی و یەكێتی ریزی گەل و كۆمەڵ كە دەفەرموێت :

﴿وإن طائفتان من المؤمنين اقتتلو فأصلحو بينهما﴾ الحجرات: ٩

لەکۆتایی ئەم باسە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کەچاك کردنەوەی نێوان خەڵك بەیەکێك لەو هۆکارانە دەژمێردرێت کە پارێزگاری لەیەکێتی گەل و نیشتمان دەکات و پێویستە لەسەر گەلان ڕەچاووی ئەم خاڵانە بکەن و ڕۆڵەکانیان لەسەر ئەم ڕەوشتانە پێ بگەێنن لەرێگای دەزگا ڕۆشنبیر و پەروەردەیی‌یەکان دا ئەمیش گشتی بۆ مانەی کۆمەڵە بەشێوەیەکی یەکگرتوو، لەبەر ئەوەی بەیەکگرتن دەتوانین بگەینە هەموو ئامانج و ئاواتێك.

## ٣- هەواڵ پرسین و سەلاو کردن

هەوڵ پېرسین وسەلاو کردن لەڕەوشتە بەرزەکانی ئادەمیزادی پێش کەوتوو خوازو مرۆڤی کراوەیە وە لەسەر داواکاری خودای گەورەو مەهیرەبان پێوسیتە ڕۆڵەکانی گەل لەسەر ئەم ڕوەشتە بەرزە پەروەردە بکرێن لەبەر ئەوەی بەهۆی ئەم کردارە دەتوانرێت پارێزگاری لەپەیوەندیە کۆمەلایەتی‌یەکان بکرێت بەشێوەیەك کەپێویستە بەهێز تریش بکرێت.

ئەوەی شایەنی باسیشە سەلاو و هەواڵ پرسین سنووری گەلێك شت دەشکێنێت و گەلێك بەر بەستیش دەشکێنێت لەنێوان تاك و چینەکانی کۆمەڵ دا بەجۆرێك لەیەکتری نزیك دەبنەوەو بەئاسانی لەتەنگەشەو نائارامی باری یەکتر دەگەن بەجۆرێك مافی ئەوە بەیەکتری دەدەن کە بێنە ناو ئەم تەنگەشە کۆمەلایەتیانەو بەراوێژکاری باسی باری خۆیان بۆ یەکتری بکەن و یارمەتی یەکتریش بدەن بۆ رزگار بوون و کۆتایی پێ هێنانی ئەم تەنگەشانە.

بەم کردارەش پەیوەندی نێوانیان بەهێزترو بەتێن تر دەبێت واتە لەیەکتری زیاتر نزیك دەبنەوە بەجۆرێك کەپشتیوانی و پشتی یەکتری دەگرن لەکاتی شەرو خۆشی دا وە ئەم هۆکارەش وەکو باسسمان کرد یەکێك لەداوا ئایینی‌یەکان کە پێویستە لەسەر باوەڕدارن ڕەچاوی بکەن لەکارو بار ژیانی ڕۆژانەیان دا وەلەکاتی پەیوەندی

کردنیان لەگەڵ یەکتری دا کەلە پەیامی پیرۆزیدا دەفەرموێت: ﴿وإذا حييتم بتحية فحيوا باحسن منها او ردوها ان الله كان على كل شئ حسيبا﴾ النساء: ٨٦
بەهەمان شێوەش داوا لەباوەرداران دەکات کەبۆ بەهێز کردنی پەیوەندی کۆمەلایەتی لەنێوانیان دا کە پێویستە هەواڵی یەکتری بپرسن و سەردانی یەکتری بکەن بەجۆرێك لەپێش وەخت داوای رێگاپێدانیان لێ بکرێ لەبەر ئەوەی رێکخستنی کات بەکێکە لەرەوشتەکانی مرۆڤی پێش کەوتوو کەخودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿ياايها الذين امنوا لاتدخلوا بيوتا غير بيتكم حتى تستانسوا وتسلموا على اهليها ذلكم خير لكم لعلكم تذكرون﴾ النور: ٢٧

یەکێك لە نەخۆشیەکانی سەردەمی ئەمڕۆمان کە ئادەمیزاد هەستی پێدەکات و پیەی دەناڵێنی و هەردەم هەوڵ دەدات لێی رزگار بێت ..... هەست کردنە بەوەی کە گوزەرانێکی تەنگ و ژیانێکی ناخۆش بەسەر دەبات.

ئادەمیزادی ئەمرۆ هەردەم هەست بەبێ ئارامی دڵ و دەروون و کەم و کوری دەکات بە جۆرێك وا دەزانێ ژیانی وەستاوەو هەموو رۆژ شەوێك لە ژیانی دا وەك یەك وایە وە هەردەم لە هەوڵ دان دایە بۆ بەدەست هێنانی ئارامی دڵ و دەروون کەبە نرخترین و بەرزترین شت دادەنرێت بۆ بەردەوام بونی ژیانی ئادەمیزاد و رزگار بوونی لە نەخۆشی لە بەر ئەوەی گەلێ لەو نەخۆشی یانەی کە تووشی ئادەمیزاد دەبێت هۆیەکەی دەگەرێتەوە بۆ هەست کردنی ئادەمیزاد بەم سیفەتە کە دەبێتە هۆی بەرز بوونی پاڵەپەستۆی خوێنی و تووش بوونی بەچەندین نەخۆشی دەروونی و چەندین تەگەرەی کۆمەڵایەتی ئینجا لەبەر ئەوە هەموو توانای خۆی دەخاتە گەر بۆ گەیشتن بە ئارامی لە ژیانی دا وەلە هۆیەکانی دەکۆڵێتەوە. وە لە پرسیارکردنی دا ئایا هۆی ئەوە دەبێ چی بێت؟!

لە وەڵام دا هۆی ئەوە دەگەرێتەوە بۆ روو وەرگێران و پشت کردنە لە رێنمایی خودای گەورە کە لە قورئانی پیرۆزدا ئاگادارمان دەکاتەوە و دەفەرمووێت:

﴿ ومن أعرض عن ذكري فإن له معيشة ضنكاً ونحشره يوم القيمة أعمى ﴾ سورة طه: ١٢٤

واتە هەرکەسێك رووی وەربگێری لە رێنمایی من و پشتی تێبکات ئەوا ئەو کەسە گوزەرانێکی زۆر تەنگی دەبێت و ژیانێکی ناخۆش بەسەر دەبات وە لە رۆژی دواییدا بە کوێری حەشری دەکەین.

وە بە پێچەوانەی ئەو کەسەوە باوەرداری راستەقینە نرخی ئارام بوون دەزانێت لە بەرئەوەی پیی گەیشتووە و دەزانێت ژیانی کامەرانی و پاك و خاوێن و بەرەکەت دار دەکات.

لە بەر ئەوەی هەرکەسێك بە باوەرەوە و پڕ بەدڵ بڵێت ( لا الە الا اللّٰە ) دەچێت بۆ بە هەشت وەخودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرمووێت :

﴿ وننزل من القرآن ماهو شفاءٌ ورحمة للمؤمنين ولا يزيد الظلمين إلّا خسارة ﴾ الاسراء: ٨٢

واتە لەم قورئانەدا دەرمان و چارە سەری هەیە بۆ باوەرداران وە چارەسەرە بۆ وەسوەسەو بێ ئارامی دڵ و سەرگەردانی وەمیهرەبانی‌یە بۆ باوەرداران. بەلام بەپێچەوانەی ئەوان ستەمکارە بێ باوەرەکان سوودی لێ وەرناگرن تەنها زیان نەبێت .

وە بێجگە لەمانەش شوێن کەوتنی رێنمایی و بەرنامەی خودای گەورە بەرێك و راستی دەبێتە هۆی فراوانی سامان و دارایی و نازو نیعمەت وەدەبێتە هۆی دوور کەوتنەوە لەبەلاو بەسەرهاتی خراپ کە ژیان تاڵ دەکات .

خودای گەورە لە قوئانی پیرۆزدا دەفەرمووێت:

﴿ .. ومن يتقِ اللّٰه يجعل له مخرجاً ، ويرزقه من حيث لايحتسبُ ومن يتوكل على اللّٰه فهو حسبهُ إنّ اللّٰه بلغ امرهِ قد جعل اللّٰه لكلِ شيءٍ قدراً ﴾ الطلاق:٢، ٣

واتە هەرکەسێك لە خودا بترسێ و رێنمایی پەیامی خودا بکات خودا دەرگایەکی بۆ دەکاتەوە بۆ ئەوەی لە گیرو گرفتی رزگاری ببێت وەسامان و دارایی دەداتێ لەلاییك کە بەهیچ جۆرێك بە خەیاڵی دا نەهاتبێ کە لەم شوێنە سامانی بە دەست بکەوێت:

﴿ وَلَو أَنَّ أَهلَ القرىَ امنوا وأتقوا لَفَتَحنا عَلَيهِم بَرَكت من السَّماءِ والأرضِ ولكن كذّبوا فأخذنهم بما كانوا يكسبون﴾ الاعراف: ٩٦

واتە ئەگەر دانیشتوانی ئەو شوێنانەی کە سزا دراوون بڕوایان بهێنابایە وەخۆیان بپارێزابایە لەو شتانەی کە قەدەغەم کردبوون لەسەریان ئەوا دەرگای چەند پیت و سامانم لەسەریان دەکردەوە لە ئاسمان و لەزەوی دا بەڵام ئەمانە باوەڕیان نەهێنا بە پێغەمبەرەکانیان ئینجا ئێمەش سزامان دان بە هۆی ئەو کردەوە خراپانەی کە دەیان کرد.

بە گوێرەی ئەم ئایەتە ئادەمیزاد بەگوێرەی کردەوەی خراپ و چاکەکانی لە تەرازووی باوەردا سزا دەدرێتەوە بە مانای ئەوەی چەند تاوان بکەین زیاتر دڵ ڕەق و دڵ تەنگ دەبین لەبەر ئەوەی تاوان دەبێتە هۆی ڕەش بوونی دڵ وە دڵیش کەڕەش ببێت دەبێتە هۆی دوور کەوتنەوەی خاوەنەکەی لە خودای گەورە.

﴿ كلاّ بل ران على قلوبهم ماكانو يكسبون﴾

هەروەها تاوان و خراپە کردن دەبێتە هۆی کەم کردنەوە و داگرتنی پێ دانی سامان و دارایی بە خاوەنەکەی واتە ( رزقی دەبەسترێت)

**( لايزيدُ في العمر الاّ البُر ولا يردُ القدر الاّ الدعاء وإنَّ الرجُلَ ليُحرَم الرزقَ بخطيئةٍ يَعمَلها )** رواه ابن ماجة

واتە تەنها چاکە پەرە بە ژیانی مرۆڤ دەدات وەتەنها پاڕانەوە لە خودای گەورە نوسراو ( القدر ) دە گەڕێنێتەوە وە ئادەمیزاد بێ بەری دەکرێت لە رزق دان بەو خراپەیەی کەدەیکات ... وە لەگەڵ ئەوەش دا ئادەمیزاد هەندێك جار هەندێك کردەوە دەکات جگە لە خراپە کردنی ئەم کردەوەیە دەبێتە هۆی لە ناو چوونی چاکەکانیشی یەبێ ئەوەی هەندێك جار کە هەستیش پێ بکات.

## کۆمەڵگای نموونەیی

بە مەبەستی گەیشتن بە کۆمەڵگایێکی نمونـەیی خـودای گـەورە و میـهرەبان چـەند ئەرك و خورەوشتێکی بە دیارخستوە کە پێویستە لـە سـەر بـاوەرداران پارێزگـاری لەسـەر بکـەن و ڕێنمـایی داواکاریـەکانیش بن بـە مەبەسـتی دارشـتن و داهێنـانی ئـادەمیزادێکی بەسـوود وە ئـەم کردەوانـە ی کـە باسیان دەکـەین لـەم بەشـەدا دەوریان هەیە لە پاراستن و پارێزگاری کردنـی یـەکێتی ریـزی گـەڵ لـە لایـەك و لـە لایەکی ترەوە پەیوەندیەکی زۆر بەهێزیان هەیە لەسەر دڵ و دەروونـی ئـادەمیزاددا کە کاردەکەنە سەر پەیوەندیە کۆمە لایە تیەکانیان لە ژیانی ڕۆژانـەیان دا وە لـەم بەشەدا لە ژێر ناونیشانی کۆمەکی دەروون ئەم کردەوانە بـۆ خوێنـەری بـەڕێز ڕوون دەکەینەوە.

ڕەنگـە خوێنـەر بـیر لـەوە بکاتـەوە و پرسـیاز بکـات ئایـا ئـەم کردەوانـەچ پەیوەندیەکیان هەیە بەدەروونی ئادەمیزاد دا؟ وە ئەم کۆمەکیە لەکوێ دایە ؟

پەیوەندی ئەم کردەوانەی کەئیستا دەیخوێنیتەوەبـە دوەروونی ئـادەمیزاد لەیـەك خاڵ دایەکتر دەگرنەوە ئەویش لە دڵە.

بەڵێ دڵی ئادەمیزاد ئەوخاڵەیە کەکردەوەکانی ئادەمیزاد لەگەڵ دەوونـی بەیـەکتر دەگەن .

لەبەرئـەوەی مێشـکی ئـادەمیزاد کـاتێك ئەندامـەکانی لـەش ئاگاداردەکاتـەوەو فەرمانیان لەسەر دەدات بۆ ئەنجامدانی چەند کارو کردەوەیەك سەیر دەکەی ئەگەر بێت و دڵی ئەم کەسە ئەم کـارەی پـێ خـۆش نـەبێت ئـەوا لـەپاش ئـەنجام دانـیدا تووشی دڵە ڕاوکێ دەبێت وە ئەم دڵە ڕاوکیـیە کار لەهەسـت و نەسـتی ئـەم کەسـە دەکات بەهۆی بیرکردنەوەی لەو کارەو ئەنجامەکانی دا.

بۆیـە دڵ بـەخاڵی بەسـتنەوە دادەنرێـت لـەنێوان دەروونـی ئـادەمیزادو کـارو کردەوەکانیدا.

وەلەلای هەموو ئادەمیزادێك روون و ئاشكرایە لەوانەیە بەم كردارەش تێ پەڕیبێت وەهەستی بەوە كردبێت كەدڵی وەكو تەرزووی كارەبا وایە بۆگشت دەروونی چۆن بەكەم و زیاد بوونی كار لەئامێرە كارەباییەكان دەكات بەهامان شێوە بەزیاد بوونی و كەم بوونی باوەر لەدڵی ئادەمیزاد كار لەدەروونی دەكات.

وەسەبارەت بەپەیوەندی دڵ بەدەروونی ئادەمیزاد پێغەمبەر (ﷺ) ئامـاژە بۆئـەم خاڵە دەكات كەدەفەرموێت: **(عن ابي عبدالله النعمان بن بشير رض الله عنهما قـال : سمعت رسـول الله (ﷺ) يقـول: ان الحـلال بـين وان الحـرام بـين وبينـهما امـور مشتبهات، لايعلمهن كثير من الناس فمن اتقى الشبهات ، فقد استبراء لدينه وعرضه ، ومن وقع في الشبهات وقع في الحرام،كالراعي يرعـى حـول الحمـى يوشـك ان يرتع فيه الا وإن لكل ملك حمى الا وان حمة الله محارمه،**

**الا وان في الجسد مضغة اذا صلحت صلح الجسد كله واذا فسدت فسد الجسـد كلـه الاوهي القلب).** رواه بخاري ومسلم

لێرەدا پێغەمبەر (ﷺ) بێت لەرێزی كۆتایدا ئاگادارمان دەكاتەوە لەدڵی ئادەمیزاد كەئەگەر ئەم دڵە باش بێت وهەموو لاشەو ئەندامەكانی ئادەمیزاد باش دەبێت وەبەپێچەوانەوە دەبێت ئەگەر بێت و ئەم دڵە خراپ بێت.

وەبەهەمان شێوە خودای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت

﴿الا بذكر الله تطمئن القلوب﴾ سورة الرعد: ٢٨

واتە تەنها بەرۆیشتن لەسەر پەیام و پرۆگرامی خودای گەورە لەكارو كردەوەكانمان دا دڵمان دەحەسێتەوەو چۆنیەتی ئەم ئارامی گرتنەش پەیوەندی بەدەروونزیكی ئادەمیزادەوەهەیەبەرامبەر بەخودای گەورە ئەمەش بەگوێرەی پلەو پایەی چاكەكانی ئادەمیزادە لەتەرازووی كردەوەدا.

کاری کۆمەکی دەروون لێرەدا بەهانا هاتن و ئاگادار کردنەوەی گشت کۆمەڵی ئادەمیزاد بووبەگشتی لەوچەند کردارو کردەوانەی کەکار لەتەرازووی باوەڕ دەکەن و بەلای خراپە دای‌نەشکێنەوە لەلایەك لەلایەکی تر ئەنجام دانی ئەم جۆرە کردارو کردەوانە دەبێتە هۆی کار کردن لەسەر دڵ و دەروونی ئادەمیزاد بەجۆرێك هەر کردەوەیەك بەشێوەیەك کارو کاردانەوەی خۆی دەکاتە سەر ئادەمیزاد بەگوێرەی کار کردنیان لەسەر کردەوە چاکەکانی ئادەمیزاد لەبەر ئەوەی ئەم کردەوەچاکانەی کە ئادەمیزاد لەژیانی دا ئەنجامی دەدات لەتەرازووی باوەڕ بۆی پاشەکەوت دەکرێت وەبەگوێرەی کەمی‌و زۆری ئەم کردەوانە دڵ و دەروونی هەست بەخۆشی دەکات‌و هێزی ئارام گرتنی پێ دەبەخشرێت بەرامبەر بەو تەگەرانەی کەدێنە پێشی‌یەوە و بەسەری‌دا زاڵ دەبێت.

واتە چاکەکانمان بەکارێکی تازە بوونەوەی دەروون هەڵدەستن وەئەم کردەوانەی کەئیستا باسیان دەکەین هەریەکێکیان جۆرە کردارێکی هەیە لەسەر کۆمەڵ و تاك دا بەجۆرێك هەندێکیان کار لەدەروونی ئادەمیزاد خۆی دەکات وەکو هاوبەش دان بۆ خوداو باوەڕ بەجادووکەر وەهەندێکیان کار لەبەرامبەر دەکات وەکو حەسودی ریابازی وەهەندێکیان کار لەگشت کۆمەڵ دەکات وەکو بیدعە و دووڕووی پشتیوان بەخودای گەورەو میهرەبان بەکورتی باسی ئەم کردەوانە دەکەین بەپێی قۆرئان وفرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ)

## باسی یەكەم

## كردەوە لەناو بەرەكان:

بریتین لەو سێ كردەوانەی كەدەبنــە هۆی لـەناو چوون و ڕەش كردنـەوەی گشت كردەوە چاكەكانی پێش خۆیان ئەوانیش:

هاوبەشی دانان بۆ خودا، دووڕوویی(نفاق) واز لەنوێژ هێنان:

وەئەم كردەوانە بۆیە پێیان دەڵێن لەناو بەرەكان چونكە دەبێتەهۆی بەتاڵ كردنــی تـەواوویی چاكـەو داشـكانی بـەرەو خراپـەو كاركردنیـــان لەســـەر دڵ و دەروونـــی ئادەمیزاد بەجۆرێك هەموو سیفەتێكی ئادەمیزاد لەناو دەبەن.

ئەدی چۆن كاتێك تۆ باوەڕت بەبوونی خودای گەورە نەبێت یان تۆچەند بـت و دارو شتی بینراو دەپەرستی ودەیان كەیە هاوبەش بـۆ خـودای گـەورە و میـهرەبان ئایا ئەوە لەناو بردنـی هەستی مرۆڤایـەتی نییـە كـاتێك تـۆ بتێك كەلـە جێگای خـۆی وەستاوەویێ دەنگە یان كەسێك یان هەر شـتێكی‌تر لـەخۆت گـەورەتر بزانـی و بـی پەرستی و كڕنۆشی بۆببەی ئایا ئەوە كەم كردنەوەی نییە لەپلـەی ئـادەمیزادییت، كەچۆن تو بیرناكەیتەوە لەو شتانە چۆن بیر لەئاسمان و لەدەورووبەرت ناكەیتـەوە كەتەنها خودای گەورە داهێنەری گشت گەردوونـە هەر خـۆی بەخشـەرو ڕۆزیـدەرو كەسی‌تر هاوبەشی ناكات.

## كردەوەی یەكەم

## هاوبەشی دانان بۆ خودای پەروەردگار:

مەبەست لە:

هاوبەش دانان بۆ خودای گەورە واتە دانانی سـیفەتێك لەسیفەتەكانی خـودا و پـاڵ خستنی بۆ كەسێكی یان شتێك وەكو سیفەتی غەیب زانین.

یەکێك لە سیفەتەکانی ئادەمیزاد لەکاتی لەدایك بوونی‌یەوە هەتاوەکو مردنی هەست کردنی‌یەتی بە بونی خودایەك (واتە هەست دەکات بەداهێنەرێك وەیەکێك لەو تەگەرانەی کەتووشی ئادەمیزاد بووە لەم بارەیەوە هاوبەشی دانانە بۆ خودای گەورەو میهرەبان.

وەبەم جۆرە ئەم کارە بووە هۆی سەرلێ شێواندنی خەڵك لەلایەن چەند کەسانێکەوە بەناوی پیاوانی ئاین وە دەستیان کرد لە استغلال کردنیان بۆ مەبەستەکانی خۆیان کەئەویش سەرکردایەتی و دەوڵەمەند کردنی خۆیان بوو لەسەر حیسابی ئەو کۆمەڵە هەژارە ئەویش بەرێگەی دانانی هاوبەشی بۆ خوداو دانانی چەند خودایەك وەداوای پەرستنی ئەم خودایانەیان دەکرد لەکۆمەڵەکەو داوای قوربانیان لێدەکردن، هەروەها هاوبەشی دانان بۆ خودا سەرچاوەی گەلێك لەشەڕو ئاژاوەکانی مرۆڤایەتی بوو لەمێژووی دوورو رابردوودا چونکە ئەم دەستەیە ئەم کارەیان وەکو چەکێك بەکار دەهێنا بۆ بەستنەوەی مێشك و فکری خەڵك لەبوارێکی تەسکدا وەهانی کۆمەڵیان دەدا هەرکەس للای خۆیەوە بۆ بەسەر خستنی ئەو خوایانەی ئەو.دایناوە وە لەوئەنجام دا شەڕ هەڵ دەگیرسا لەنێو کۆمەڵ دا وەچەندین کەس لەناو دەچوون و ماڵیان بەتاڵان دەبردرا.

بەم جۆرە کۆمەڵ رۆژ لەدوای رۆژ بەرەو پێش نەدەچوو وەبەرەو دواوە دەگەڕایەوەو نەهامەتی کۆمەڵی گرتبۆوە.

وەبۆ رزگار بوونی کۆمەڵ خودای گەورەو میهرەبانچەندین پەیامی بۆ زەوی ناردە خوارەوە کەلەکۆتایی هەموویان پێغەمبەر(ﷺ) بوو ئەویش لەرێگەی هۆشیار کردنەوەی خەڵك و داوای لێ کردنیان بۆ باوەڕهێنان بەخودای تاك و تەنیاو واز هێنان لەهاوبەشی دانان بوو بۆ خودای گەورەو میهرەبان وەنەفی سیفەتی بابایەتی

و كوڕایەتی‌یان كرد وەبەم جۆرە تاوەكو ئاخر پێغەمبەر ئەم كارە بەردەوام بوو هەروەكو خودای گەورەو میهرەبان لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت:

﴿قل هو الله احد الله الصمد لم يلد ولم يولد ولم يكن له كفواً احد﴾

بەڕاستی باوەڕهێنان بە هاوبەشی بۆ خوا (تعدا) كردنە لەسەر (ذاتی) خودای تاك و تەنیا، لەبەرئەوەی كاتێك تۆ باوەڕ دەهێنی بەهەر هاوبەشێك بۆ خودا وا دەگەیێنێت كەتۆ (ذاتی) خودا تاوانبار دەكەی بەنەتوانین كەئەمەش پێچەوانەی هەموو بەڵگەیەكی بینراوە وە بەهیچ جۆرێك مێشك قەبوولی ناكات لەبەرانبەر توانای خودا دا.

هەروەها لەبەر گەورەیی ئەم گوناهە خودای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا لەیەكێك لەیاساكانی بڕیاری داوە كەبەهیچ جۆرێك لەوكەسانە خۆش نابێت لەڕۆژی دوایی‌دا كەهاوبەشیان بۆ داناوە كەدەفەموێت: ﴿ان الله لايغفر ان يشرك به ويغفر مادون ذلك لمن يشاء ومن يشرك بالله فقد افترى اثما عظيماً﴾ النساء: ٤٨

واتە خودا خۆش نابێت لەوەی هاوبەشی بۆ بنرێت و هیچ شتێك بكرێ بەهاوبەشی وەخۆش دەبێت لەهەر گوناهێك بێجگە لەوە لەڕۆژی دواییدا چونكە لێ خۆش بوون لەدەستەڵاتی خوادایە هەرچەندە گوناهیشی كردبێ جگە لەهاوبەش پەیدا كردن چونكە ئەو كەسە گوناهێكی زۆر گەورەی كردووە و بۆیە لێ خۆش بوون نایگرێتەوە وەهەر لەبەر گەورەیی ئەم كردەوەیە پێغەمبەر (ﷺ) لە فەرموودەكانی‌دا كەباسی گوناهە گەورەكانی كردووە دانانی هاوبەشی بۆ خودا لەپێشەوەی گوناهە گەورەكان داناوە كە دەفەرموێت: (**الا انبئكم باكبر الكبائر ثلاث: الاشراك بالله ، وعقوق الوالدين، وشهادة الزور**) رواه مسلم

واتە گەورەی هەرە گوناهە گەورەکان سێیە یەکەمیان هاوبەش دانان بۆ خودا، دووەمیان ئازار دانی دایك و باوك، وسێیەمیان شایەدی بەدرۆدانە.

گەورەیی ئەم کردەوەیە لەوە ناوەستێت بەڵکو دەبێتە هۆی لەناو چوونی کردەوە چاکەکانیشمان کەلەپێش ئەم کردارە بەد ناوە ئەنجام دراوە وەخودای گەورە وەکو ئاگاداریەك بۆ ئادەمیزاد یاخود بڵێین بۆ هۆشیار کردنەوەی ئادەمیزاد بۆ دوور کەوتنەوەی لەو کردەوەیە دەفەرمووێت:

﴿ولقد اوحي اليك والى الذين من قبلك لئن اشركت ليحبطن عملك ولتكونن من الخاسرين﴾

لێرەدا خودای گەورە مەبەستی پێغەمبەرمانە (ﷺ) کەپێی دەڵێت کەبەتۆو بە پێغەمبەرەکانی پێش تۆش گوتراوە و ڕاگەیاندراوە کە جگە لەخوا یەکێکی‌تر بپەرستی هەموو کردەوەت لێ ڕەش دەبێتەوەو دەچیتە ڕیزی ئەو کەسانەی کەزەرەرمەندو ڕەنجەڕۆن.

لێرەدا خودای گەورە نموونەیەکمان بۆ دەهێنێتەوە بۆ سوور بوونی کەلەو گوناهە خۆش نابێت هەرچەندە چاکەکانت زۆر بێت کەپێغەمبەر (ﷺ) ئەگەر ئەم گوناهە بکات هەموو کردەوەکانی ڕەش دەبێتەوەو دەچێتە ڕیزی دۆڕاوەکان ئەی ئەگەر ئێمە بیکەین کە کردەوە چاکەکانمان بەرامبەر بە چاکەکانی پێغەمبەر (ﷺ) ناکاتە خاڵێك لە دەریایەك وەبۆ هەمان مەبەست خودای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا باسی سەرلێ شێواویو دڵە ڕاوکێی هاوبەش دانەرەکانمان بەم شێوەیە بۆ باس دەکات کە دەفەرمووێت: ﴿... ومن يشرك بالله فكأنما خر من السماء فتخطفه الطير او تهوي به الريح في مكان سحيق﴾ الحج: ٣١

واتە هەرکەسێك هاوبەش بۆ خودا دابنێ وەکو ئەوە وایە کە بەربێتەوە لەئاسمان و باڵندە بیگرێتەوە وەبی قەپێنێ یان باڵی پێوە بنێ بەرەو شوێنێکی دوورو لەناو بەر.

وەلەبەر گەورەیی ئەم گوناهە لەناو بەرە وام بەچاك زانی هەندێك باسی جۆرەکانی هاوبەشی دانان بۆ خودا بکەم کە ئەویش دابەش دەبێتە سەر سێ بەش:

**١- الرزق (رۆزی دان)** **٢- عبادە الاصنام (بت پەرستی)**

**٣- باوەرنەکردن بەشتێك لەو شتانەی خودای گەورە باسی کردووە لەنەبینراوەکان.**

**١- سامان و دارایی دان (الرزق)، رۆزی دان:**

لەلای هەموو ئادەمیزادێك روون و ئاشکرایە کەوا هیچ کەسێك لەتوانای‌دا نی‌یە کەببێتە داهێنەری و سوودی پێ بگەیەنێ وهەردەم ببەخشێ و هیچ وەرنەگرێت لەبەرامبەری دا، بەڵکو بەندە هیچی لەدەست دانی‌یە لەسوود گەیاندن یاخود رێگەگرتن لەپەرەسەندنی ئەم ئادەمیزادە بەڵکو خودا تەنها خاوەنی سوودو رێگە گرتن و هەموو ئەو شتانەیە کە پێشکەش دەکرێت بەئادەمیزاد بەبێ بەرامبەر.

خودای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿ما يفتح الله للناس من رحمة فلا ممسك لها وما يمسك فلا مرسل له من بعده وهو العزيز الحكيم﴾ فاطر: ٢

واتە هەر چاکەو بەهرەیەك خودا بەرە لای بکات و بینێرێ بۆ خەڵکی وەهەر رەحمەت و بەزەیی یەکی خۆی دەربارەی هەر کەسێك بکات لەهەر رووێکەوە هیچ کەسێك و راگیر کەرێك لەتوانای دا نی‌یە رێگای لێ بگرێ لەپاش ناردنی وەبە پێچەوانەوەش وەتەنها خودای گەورە زاڵە بەسەر هەموو شتێك دا، بەڵێ تەنگی و تاریکی توانای نی‌یە بەرامبەر بەبەزەیی وتوانای خوادا وەهەرکەسێك بەزەیی خودای لەگەڵ دابێت ئەم باوەرە دڵی رووناك دەکاتەوە بەتیشکی توانای خودا

وەدڵی بەرەوئارامی دەبـات بالـە هـەر شـوێنێکیش دا بژیـت بازیـانیش گـران بێـت بەڵکو هەردەم هەست بەئارامی دەکات و سەردەکەوێ بەسەر هەموو ئەو تەگەرانەی کەدێتەپێشیەوە با هەموو ئادەمیزادی جیـهان لـەدژی رابوەسـتن و رێگـەی دەسـت کەوتنی رۆزی لێ بگرن باهـەوڵ بـدەن و نەخشـە بکێشـن بـۆ لـەناو بردنـی ئـابووری ئەمانە هەموو هیـچ نی‌یـە بەرامبـەر بـەقاپی خـودای گـەورە کـە هـەردەم کراوەیـەو هەموو ئەم پیلانانە لەناو دەبات.

بەلام بەداخەوە کەوا دەبینین هەندێك کەس هەن باوەریان وایە کەچەند کومەلێك لەتوانایان دایە سوودیان پێ بگەیەنن وسامان ودارایی‌یان پێ بدەن وەهەمیشە هەوڵ دەدەن لێیان وەربگرن بەلام بێ سوودەو هەرچەندی دەکەن ناگەنە مەبەست لەبەرئەوەی بیرناکەنەوە کە خودا دامێنەرو سامان دەرەوە ئەوەی ئەوان بیری لێ دەکەنەوە گشتی هاوبەشی دانانە بۆ خودا وادەزانن ئەگەر لەو کۆمەڵە دابرین سامانیان دەبرێت وکەم دەبێتەوە بۆیە هەوڵ دەدەن بەهەر چۆنێك بێت دڵی ئەوکومەڵە رازی بکەن وەرچی‌یەکیان بووێت پێی هەڵدەستن بەبێ پرسیار کردن لەجۆری ئەو کارەو بۆ پێی هەڵبستن، ئەمەش گشتی‌دەگەرێتەوە بۆ باوەری ئەم جۆرە کەسانە بەخودای گەورەو میهرەبان چونکە هەموو کەسێك کەباوەری هەبێت بەخودای گەورە لەسەری دا واجبە کەباوەری هەبێت کەتەنها خودا رۆزیو سامان دەدات و کەم و زۆر دەکات بەپێی زانینی خۆی بەسەر هەموو شتێك دا وەخۆی دەزانێت بەرژەوەندی لەچی دایە کاتێك سامان و دارای فراوان دەکات بۆ کەسێك و چ کاتێك پێویستە وەچ کاتێك کاتی فراوان کردنە بۆیە دەلێم فراوان کردنە چونکە خودای گەورە رۆزی بۆ هەموو کەسێك داناوە لەکاتی لەناو سکی دایکی دایە تاوەکو رۆزی مردنی ئەمەش بەگوێرەی ژیانی دەبێت بەلام سامانی هەندێك کەس فراوان دەکات بۆ چەند مەبەستێك کەهەر خۆی دەزانێ هۆی چی‌یە یاخود کەی

دەکاتەوە پاش فراوان کردنی خودای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرمووێت:

﴿الله يبسط الرزق لمن يشاء من عباده ويقدر له ان الله بكل شيء عليم﴾ العنكبوت: ٦٢

واتە خودا رۆزی فراوان دەکات بۆ هەر کەسێك لەبەندەکانی کەخوا مەیلی بێ وتەنگ و کەمی دەکات بۆ ئەو کەسەی کەفراوانی کردوە بۆی لەبەر ئەوەی خودا لەهەموو شتێك زانایەو ئاگادارە.

هەروەها خودای گەورە دەفەرموێت:

﴿يايها الناس اذكروا نعمت الله عليكم هل من خالق غير الله يرزقكم من السماء والارض لا اله الا هو فأنى تؤفكون﴾ فاطر: ٣

واتە ئەی ئادەمی بەتێکرایی بیربکەنەوە لەچاکەی خودا بەسەر تانەوەو باسی بکەن ئایا هیچ دروست کەرو داهێنەرێکی تر هەیە لەخودا کەرۆزیتان بدات لە ئاسمان و زەوی یەوە؟ کەواتە بۆچی یادو باسی ئەو خودایە ناکەن بەتاك تەنیا و سوپاسی ناکەن؟ بێگومان هیچ پەرستراوێکی راستەقینە نی یە بێجگە لەو خودایە دروستکەرو رۆزیدەرە کەواتە چۆن ئێوە لائەدەن و روو وەردەگێرن لەوبروا راستەو لەو پەرستنە راستە، بەراستی جێگای داخە ئادەمیزاد بەو هەموو تەواوی بیرومێشکیەوە وابیر بکاتەوە رۆزی لەدەستی کەسانیتردا هەیە بێجگە لەخوداو توانای سوودو زەرەر گەیاندنیان هەیە، ئادەمیزاد کاتێ بیر لەو کەسانە دەکاتەوە سەری سوڕدەمێنێ کەچۆن ئەمانە بەم شێوەیە لایان داوە لەو رێگا راستە وەسوپاسی خودا ناکەن بەڵکو تەنها گوێ رایەڵیشی ناکەن زۆر بەداخەوە وەخوای گەورە لە قورئانی پیرزدا دەفەرموێت: ﴿امن هذا الذي يرزقكم ان امسك رزقه بل لجوا في عتو ونفور﴾ تبارك: ١٢

واتە ئایاکێ دەتوانێت سامان و ڕۆزی تان بدات ئەگەر ئەو خودایە هۆیەکانی لێ گرت؟ بەڵکو لەدڵ ڕەقێ و گەورەیی خۆیان بەردەوام بوون و لەرێگای ڕاست ودوور کەوتنەوە.

خوێنەری بەڕێز هەموو بەڵگە بینراوەکانی پێشفان هەموو بۆ چوونەکانی ئەو کەسانە بەدرۆ دەخاتەوەو بچوکترین نموونەش ئەو زیندەوەرە بچووکانەیە کە چۆن خودای گەورە ڕۆزیان دەدات یان ئەو باڵندانەکە سەیریان دەکەین چۆن خۆراکیان دەست دەکەوێت.

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: **(لاتیاس من الرزق ماتهز هزت رؤوسكما فـان الانسان تكدة امة احمر، ليس عليه قشرة ثم يرزقه الله عز وجل)** رواه ابن ماجة

واتە دڵ تەنگی نەتان گرێت کاتێك ڕۆزیتان سەرتان لێ دەشێوێنی وکەم زیاد دەکات لەبەر ئەوە ئادەمیزادکاتێك لەدایك دەبێت تەنها توێکلیشی پێوەنییە لەپاشان خودای گەورە ڕۆزی وسامانێ دەداتێ لەکۆتاییدا دەڵێم هەرکەسێك کەتەنها بیری بۆ ئەوە بچێت کە کەسێك یان هەر شتێك دەبێتە هۆی ڕۆزی دانی ئەوا ئەو کەسە هاویەش بۆ خودا پەیدا دەکات و لەڕێگای ڕاست لادەدات و دەردەچێت، وە یەکێك لە گوناهە گەورەکان ئەنجام دەدات.

لەبەر ئەوەی ئەوانەی ئەو داوای ڕۆزیان لێ دەکات ئەوانە لەتوانایان دانییە تەنها بەقەدەر دەنکە گەنمێك ڕۆزیان بدەنێ بەڵکو خودا خاوەنی هەموو شتێکە کەواتە پێویستە داوای ڕۆزی لەو بکەن ڕووی خۆمان وەربگێڕین بۆلای خوداو داوای لێ بکەن ئەویش بەزانایی خۆی ڕۆزیمان بۆ فراوان دەکات.

## ٢- بت پەرستی (عبادە الاصنام)

خراپترین و گەورەترین پیلان و کردەوە کەتووشی ئادەمیزاد بوو لەسەر دەمی کۆن وتازەدا (فتنـة القبـور)بووکە دەبێتە هۆی لەخشتە بردنی ئادەمیزادو ڕاکێشانی

بەرەو هاوبەشی پەیدا کردن بۆ خودای گەورە و میهرەبان بەکردارێکی دارێژراو وبە جۆرێك کە ئەو کۆمەڵە ئەو قەبرانەیان پەرست و چەند هەیکەلێك و شێوەێکیان لەسەر دروست کردن وێنەی ئەوانەنیان لەسەرکێشا.

وەبەرە بەرەتاوەکو ئەم بتانەیان لەگەڵ خودای گەورە پەرست بت پەرستی هەموو ئەوشتانە دەگرێتەوە کەدەپەرسترێ لەبەردو دارو رۆژو ئاگرو...هتد، لەپاڵ پەرستنی خودای گەورە یاخود بەبێ پەرستنی خودای گەورەو میهرەبان کەخودای گەورە لەقورئانی پیرۆز دابۆمان باس دەکات، کەدەفەرموێت: ﴿قال نوح رب انهم عصوني واتبعوا من لم يزده ماله وولده الا خسارا﴾ نوح: ٢١

وەهەروەها دەفەرمەێت: ﴿وقالوا لاتذرن الهتكم ولاتذرن ودا ولاسواعا ولا يغوث ولايعوق ونسرا﴾ نوح: ٢٣

وەبۆ زیاتر روون کردنەوەی ئەم کارە بۆ بارەداران خودای گەورە دەفەرموێت:

﴿فاجتنبوا الرجس من الاوثان﴾

بەڵام لەسەردەمی ئەمرۆمان دا لەگەڵ ئەم هەموو پێشکەوتنە لەبواری زانست و زانیاریدا ئامیزاد ئەگەر بێت و هەندێك بیر لەچۆنیەتی دروست کردنی خۆی بکاتەوە، دەگاتە ئەوەی کەتەنها خودای گەورە شایستەی پەرستنەو ئەو بت و داراو بەردانە هیچیان لەدەست نایێت لەرووی سوود پێ گەیاندن و بەخشین بەڵکو لەشوێنی خۆیان وە ستاون و ناتوانن تەنها جوولەیەکیش بکەن و لەجێگای خۆیان دابجولێنەوە وەئەم هۆکارەش بەخراپترین لەناوبەردرەنرێت بۆ دەروونی ئادەمیزاد کەچۆن ئەوبتەی کەبەدەستی خۆی دروستی دەکات کرنۆشی بۆ دەبات و داوای شتی لێ دەکات ئەی ئەوەکەم کردنەوە نیە لەشوێنی ئادەمیزاد کە بەو هەموو بیرو زانیاریەی کە خودای گەورە پێی داوە هەڵدەستێ بەپەریستنی داروبەردو ئاگر

و ڕۆژ...هتد، کەبەرەو سەدی بیست و یەك دەچین و دنیا لـەو پـەڕی پێشکەوتن و پێکەوە بەستن و نزیك بوونەوەی شارستانیەتی دایە هەندێك لەو کۆمەڵانە هێشتان بەو کردارە هەڵدەستن.

وەلەبەر گـەورەیی ئـەم کردارە کـە بـەخراپترین کردەوەو ڕەوشـتی ناشرینْ تریـن ئادەمیزاد دادەنرێت بەرامبەر خودای گەورە بۆیە خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: کەخراپترین سزایان دەدات لەبەر ئەوە بیرکردنەوە ئـەو هەلبەسـێنەی کەبەخودای گەورە دەکەن بەهۆی ئەو گومانە خراپانـەی کـە بیریـان لیّ دەکەنـەوە:

﴿ويعذب المنافقين والمنافقات والمشركين والمشركات الظانين بالله ظن السوء عليهم دائرة السوء وغضب الله عليهم ولعنهم وأعد لهم جهنم وساءت مصيراً﴾ الفتح: ٦

وەهـەروەها جگـە لەپەرستنی دارو بەردو ڕۆژ...هتـد هـەندێك کـەس وا دەزانـیْ کەسەرۆکەکانیان لەتوانایان داهەیە کە زەرەرو قازانج وداهاتووی خەلك دیاری بکەن ئەمەش جۆرێکە لەهاوبەش دانان لەسیفەتێك لە سیفەتەکانی خـودای گـەورە، بۆیـە ئایینی موسڵمانیەتی داوای لەم کۆمەڵە دەکات بۆ ڕزگاری بوون لەم کۆمەلایەتی‌یەدا کەدەفەرموێت:

﴿قل يأهل الكتاب تعالوا الى كلمة سواء بيننا وبينكم الا نعبد الا الله ولانشرك به شيئاً ولا يتخذ بعضنا بعضا ارباباً من دون الله فإن تولوا فقولوا اشهدوا بأنا مسلمون﴾
آل عمران: ٦٤

حەزوو ئارەزوو یەکێکە لەوشتانەی کەئادەمیزاد لەسەرەتای دروست بوونیەوە لەباوکە ئادەم و دایکە حەواوە تاوە کو ئێستا کاری لیّ دەکات، بەجۆرێك بەدوای دەکەوێت و بەگوێی داوایەکانی دەکات و لەپێناویدا بەخت دەکات هەموو شتێکی بەرزو بەنرخ هەرچەندە ئەمەش ببێتە هۆی زەرەر پێ گەیاندن و لەناو چوونی

لەهەندێك كات دا كە دەفەرموێت: ﴿افرايت من اتخذ الهه هواه واضله الله على علم وختم سمعه وقلبه وجعل على بصره غشاوة فمن يهديه من بعد الله افلا تذكرون﴾ الجاثية: ٢٣

**٣- باوەڕ نەکردن بەشتێك لەو شتانەی خودای گـەورە باسـی کـردوە لەنـەبینراوەکان (الغیب):**

هەمووشتێك بەپێچەوانەی خۆی دەناسرێت، رەش بەهۆی سپی دەناسرێت هەروەها بەم جۆرەش باوەر بەکفر دەناسرێت.

باوەڕ بریتی‌یە بەبڕیاردان بەبوونی خودای گەورە و باوەڕ هێنان بەهەموو شتێك کـە پێغەمبەر (ﷺ) بۆمانی هێناوەو لـەخودای گـەورە و میـهرەبانی گێراویەتـەوە، واتـە لەسەر موسڵمان دەبێت باوەڕی هەبێت بەهەموو ئەوشتانەی کەپێویسـتە بـۆ تـەواو کردنی باوەرەکـەی کـەدەبێت بـاوەڕی هـەبێت (بـەخودای گـەورەو، رۆژی دوایـی، فریشتەکان،پێغەمبەران، القدر (نوسراو)، کتابەکانی خودای گەورە).

وەنـا بێت موسڵمان بـاوەڕی هـەبێت بەهـەندێك و بـاوەڕی نـەبێت بەهـەندێکی تـر لەبەرئەوەی هەر کەسێك وابکات ئەوا دەردەچێـت لـەئایینی موسـڵمانیەتی وەلەبـەر ئەوەی شوێنێکی ناوەندی نیە لەنێوان کفرو باوەڕدا، وەهیـچ شـك و گومـانی تیـادا نیە کەباوەڕ بوون بـەخودای گەورە سـەرچاوەی گشـت خـێرو خۆشـی‌یەکە لەسـەر ڕووی زەوی دا وەباوەڕنـەهێنان پـێ‌ی دەبێتـە سـەر چـاوەی هـەموو خراپیـەك و نەهامەتیەك باوەر هێنان بە خوای گەورە وا لە ئادەمیزاد دەکات کە بە شـێوەیەکی نمونـەیی‌و رێـك پێـك کردەوەکـانی لەگـەڵ دەوروبـەری‌دا رێـك بخـات ئەمـەش سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ باوەر هێنان بەوەی کە خـودای گـەورە ئاگاداره بـە کردەوەکانی دیارو نادیاری کە ئەنجامی دەدات بۆیە ڕێگای راست دەگاتـە بـەر لـە کاتی ئەنجام دانیان دا.

کردەوەکانی دیارو نادیاری کە ئەنجامی دەدات بۆیە ڕێگای ڕاست دەگاتە بەر لە کاتی ئەنجام دانیان دا.

وە باوەڕ بوون بە ڕۆژی دوایی دەبێتە هۆی ڕۆیشتنی خەڵك و ڕاستە ڕێ بوونیان لەسەر پەیامی موسڵمانیەتی وە لە پێناو ڕازی بوونی خودای گەورەد ڕێگای چاکە دەگرنە بەر.

وە باوەڕ هێنان بە خودای گەورە وا لە دەروونی ئادەمیزاد دەکات کە هەست بە ئارامی بکات بە جۆرێك وەکو تریسکانێك دڵی ڕووناك دەکاتەوە لە تاریکی دونیادا بە پێچەوانەوە ئادەمیزاد هەردەم هەست بەوە دەکات کە هەدردەم لە ژیانی ناتەواوییو بۆشایی و کەم و کوری هەیە بە جۆرێك کە بۆشاییێك پڕ دەکاتەوە بۆشایەکی تر سەر هەڵدەداتەوە باشترین ڕێگا بۆ ڕزگار بوون لەم نەخۆشیەدا لەسەر ئادەمیزاد پێویستە خودای گەورە یاد بکاتەوەو لە بیری نەکات لە کاتی ئەنجام دانی کردارەکانیدا وە بەم جۆرە ئارامی تووشی دڵ و دەروونی دەبێت کە دەفەرموێت:

﴿الذين آمنوا وتطمئنُ قلوبهم بذكر الله ألا بذكر الله تطمئن القلوب﴾

الرعد: ٢٨

جگە لە مانەی باسمان کرد یاد کردنەوەی خودای گەورە لە کردارەکانمان دا ڕێگەیەکە بۆ دەست کەوتنی لێهاتوویی و زانیاری کە بە خاڵێکی گرنگ دادەنرێت بۆ خۆشی ئادەمیزاد لەبەر ئەوەی ئەو کەسەی کە هەردەم خودای گەورەی لە یادە وای لێ دەکات کە بیر لە دروست کراوەکانی خودای گەورە بکات و بە دوای زانینی هۆیەکانی دروست کردن بگەڕێت لە ژیاندا وە سەر بکەوێت بەسەر ئەو تەگەرانەی کە دێنە پێشەوە لە ژیانیدا بە جۆرێك کە بڕیاری لەجێو ڕێگای ڕاست بگرێت.

## ٣- دووڕوویی (النفاق)

دووڕووی بریتی‌یە لەیەك نەگرتنی قسەو کردەوەی خاوەنەکەی واتە بەقسە شتێك دەڵێت وەبە کردەوەش شتێکی تر دەکات.

وە دووڕوویی دوو جۆری هەیە یەکەمیان دووڕوویی لەباوەڕ وە دووەمیان دووڕووی لەکردەوە.

وەبابەتی ئێمە یەکەم بەش دەگرێتەوە واتە دووڕووی لەباوەڕ.

دووڕووی لەباوەڕ دووەم کردەوەیە لەکردەوە لەناو بەرەکان کەدەبنە هۆی لەناو چوونی کردەوە چاکە کانمان پاش هاوبەش دانان بۆ خودا.

هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سیفەتە خراپەی کە ئەو کۆمەڵە پێی هەڵدەستن کەجۆرێك لەفێل وغش بەکاردەهێنن لەگەڵ موسڵمانان دا بۆ ئەوەی (رضای) موسڵمانان بەدەست بهێنن لەلایەك و لەلایەکی‌تردا بۆ ئەوەی لەتوڕەیی کۆمەڵ موسڵمانان دڵنیا بنو بتوانن لەنێوانیاندا بژین بەبێ ئەوەی تووشی هیچ تەگەرەیەك بن و لەدەرەوەش کاتێك لوە کۆمەڵە دادەبڕێن ناوی موسڵمانان پیس دەکەن کاتێك بەو کردەوە خراپانە هەڵدەستن ئەم هۆکارەش لەلایەن هەموو کەسێك دیارە کەڕۆژێ چەندین کەس لەو جۆرە کەسانە دەبینین کەلەمزگەوت لەگەڵ کۆمەڵی موسڵمانان نوێژ دەکات وبەڕەواڵەت زۆر خوێن شیرینەو دڵسۆزو بەباوەڕدار دیارە بەڵام کە دەچێت بۆ کار یان هەر کردەوەیەکی‌تر بێت سەیر دەکەی چەندین پیلان و غش لەگەڵ برای موسڵمانی دەکاتو بەناوی موسڵمانێتی لەخشتەی دەبات، هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە کەئەو جۆرە کەسانە لەدوو دڵی دان لەباوەڕهێنانیان بەخودای گەورە و میهرەبان وە هەردەم لەدڵە ڕاوکێ دان بەرامبەر بە باوەڕیان بەخودای گەورە وە خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەموێت: ﴿ومن الناس من يقول امنا

باللّٰه وباليوم الاخر وماهم بمؤمنين، يخادعون اللّٰه والذين امنوا وما يخادعون الاانفسهم وما يشعرون﴾ البقرة: ٨-٩

ئەم دوو ئایەتە ڕاستی ئەو جۆرە کەسانەمان بۆ دیاری دەکات و سیفەتی باوەڕداریان لێ دوورئەکاتەوەو بەدرۆزن وفێڵ باز ناویان دەبات کە ئەمانە فێڵ لەخوداو موسڵمانان ناکەن بەڵکو فێڵ لەخۆیان دەکەن هەر لەسورەتی (البقرة) لە (١٢) ئایەتی یەکەم دا خودای گەورە لە (٢) ئایەت باسی موسڵمانان و لە (٣) باسی کافرەکان دەکات بەڵام بە (٧) ئایەت باسی منافقەکان دەکات ئەمەش لەبەر گەوەیی ئەو کردەیەو گرانایی لەسەر کۆمەڵی موسڵمانان.

وەدەڵێن موسڵمانان باوەڕیان بریتی‌یە لەکەمی عقل وزانین واتە موسڵمانان لەبێ مێشکی خۆیان باوەڕیان هێناوە وگاڵتە بەموسڵمانان دەکەن.

﴿واذا قيل لهم امنوا كما امن الناس قالوا انؤمن كما امن السفهاء الا انهم هم السفهاء و لكن لايعلمون ﴾ البقرة: ١٣

بەم جۆرە بەردەوام بوون و گەمەوگاڵتە پێ کردن بە موسڵمانان بووە هۆی ئەوەی کەدڵی ئەو جۆرە کەسانە بەتاڵ ببێتەوە لەباوەڕی ڕاست وە دوور بکەونەوە لەڕێگای ڕاست و بەرەو هەڵدێرو لەناو چوون بچن بەجۆرێك کەوابیر بکەنەوە کەدەتوانن لەلێپرسینەوەی خودا ڕزگاربن ئەمەش هەمووی لەبەر پیس بوونی باوەڕیان بەخودای گەورەو هەست کردنیان بەوەی کە دەتوانن فێل لەخوداو پێغەمبەر (ﷺ) بکەن کەخودای گەورە بۆ ڕوون کردنەوە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت:

﴿ان المنافقين يخادعون الله وهو خادعهم واذا قاموا الى الصلواة قاموا كسالى يراءون الناس ولا يذكرون الله الا قليلا﴾ النساء: ١٤

وە یەکێك لەرەوشتەکانی منافقەکان بەدرۆ باوەڕهێنانە واتە درۆزنـن و درۆ زۆر دەکەن لەقسەکانیان وە ئەمەش بۆ ناسینەوەی ئەو کەسانەیە هەر بۆیە خودای گەورە سورەتی منافقون بەم ئایەتە دەست پێ دەکات کەدەفەرموویێت:

﴿اذا جاءك المنافقون قالوا نشهد انك لرسول الله والله يعلم انك لرسوله والله يشهد ان المنافقين لكاذبون﴾ المنافقون:١

وە بۆ زیاتر روون کردنەوەی ئەم کردارە خراپەو پەیوەندی توندی ئەو کەسانە و ڕۆیشتنیان لەسەر ئەو ڕێگایە بەجۆرێك کە هەر سوێند بەدرۆ دەخۆن تاوەکو ڕۆژی قیامەت بەڵکو کار لەمەش ناوەستێت بەجۆرێك لەرۆژی قیامەتیش لەکاتی لێپرسینەوە پەنا دەبەنە بەهەمان رێگا واتە بەدرۆ سوێند دەخۆن کە دەفەرموێت:

﴿يوم يبعثهم الله جميعا فيحلفون له كما يحلفون لكم ويحسبون انهم على شيء الا انهم هم الكاذبون﴾ المجادلة: ١٨

وەلەبەر ئەوە ئەم جۆرە کەسانە هەرچەندە خێرو چاکە بکەن لێ یان وەرناگیرێت وەهەردەم لێیان ڕەش دەبێتەوەو بەسەریان دادەرێتەوە لەبەر ئەوکارە خراپەی کەپێی هەڵدەستن وە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿قل انفقوا طوعا او كرها لن يتقبل منكم انكم كنتم قوما فاسقين﴾ التوبة: ٥٣

وەهەر لەبەر گەورەیی و خراپی ئەم كردەوەیە خوای گەورە رەدی داوای پێغەمبەر (ﷺ) دەداتەوە كە دەفەرمووێت: ﴿سواء عليهم استغفرت لهم ام لم تستغفر لهم لن يغفروا الله لهم ان الله لايهدى القوم الفاسقين﴾ المنافقون: ٦

وە بۆ بەدیار خستنی و ناسینی ئەم كۆمەڵە بەشێوەیەكی باشتر لە قورئانی پیرۆزدا خودای گەورە بۆمان روون دەكاتەوەو بە (فاسق) ناویان دەبات ئەمەش لەبەر ئەوەی ئەم كۆمەڵە یەكەم جار باوەڕیان هێنا بەڵام لەپاشان پەشیمان بوونەوەو كافر بوون پاش باوەڕ هێنانیان وە ئەوان باوەڕیان بەڕۆژی دوایی نییەو هیچ حسابێك بۆ خودا دانانێن تەنها حساب بۆ دەوروو بەری خۆیان دەكەن لەو خەڵكانەی كەلەگەڵیان دادەژین وە كارو باری خۆیان هەر لەو سنورە بچووكە رێك دەخەن وەسوێند بۆ موسڵمانان دەخۆن بەدرۆ بۆ ئەوەی رازیان بكەن كە دەفەرموێت: ﴿يحلفون لكم لترضوا عنهم فان ترضوا عنهم فان الله لا يرضى عن القوم الفاسقين﴾ التوبة: ٩٦

وە دەرئەنجامی ئەم كۆمەڵەیە ئاگری دۆزەخە بەجۆرێك كەخودای گەورە بەدوای دوژمنانی خۆی دەیان كاتە نێو ئاگری جەهەنەم كە ئەوانیش كافرەكانن (بێ باوەڕەكان) بەڵكو لە هەندێك شوێن دا پێكەوەیان كۆ دەكاتەوە لەئاگری دۆزەخ دا كە دەفەرموێت: ﴿ويعذب المنافقين والمنافقات والمشركين والمشركات الظانين بالله ظن السوء عليهم دائرة السوء وغضب الله عليهم ولعنهم واعد لهم جهنم وساءت مصيراً﴾ الفتح: ٦

وە دڵی باوەڕدا تسلیم بوونەوەیە بۆ خودای گەورەو میهرەبان و بەگوێی كردن و گوێڕایەڵی داوایەكانی پێغەمبەرە (ﷺ) و پەیرەو كردنی پەیامی ئیسلامە لەلایەن

ئادەمیزادی باوەڕدار بەڵام ئەم کۆمەڵەیە (منافقەکان) لەبەر پیسی باوەڕیان کە هەردەم لەرزین دا بەرێ دەگرن لەئایەتەکانی خوداو بەپێچەوانەی داخوازییەکانی کاردەکەن پێوەری باوەڕ کە خاوەنەکەی لەنفاق رزگار دەکات بریتییە لەرازی بوون بەحوکمی خودا لەلایەك و لەلایەکی تریش رازی بێت بەدادوەری پێغەمبەر (ﷺ) بێت لەبەر ئەوەی هەر کەسێك گوێ ڕایەڵی پێغەمبەر (ﷺ) بکات ئەوا وەکو ئەوە وایە کەگوێ ڕایەڵی خودای گەورەی کردووە بەمانایەکی تر گوێ ڕایەڵی داخوازییەکانی خودای گەورە بەستراوە بەگوێ ڕایەڵی پێغەمبەر (ﷺ) کە دەفەرموێت: ﴿من يطع الرسول فقد اطاع الله﴾ النساء: ٨

**کاری نفاق لەسەر کۆمەڵگادا:**

بزرنیەو ڕوون و ئاشکرایە لەلای هەموو کەسێك کەخواری (نفاق) رەوشتێکی ترسناکە بەتایبەتی لەسەر کۆمەڵی موسڵمانان چونکە هەر لەپرێك دا ئەم جۆرە کەسانە هەموو حسابێك لەموسڵمانان تێك دەدەن و بەپێچەوانەی ئەو شتانەی کە داوایان لێ دەکرا کار دەکەن و دەبنە تەگەرەو رێگر لەپێش موسڵمانان ئەویش بە دروست کردنی بۆ شایی بۆ کۆمەڵی موسڵمانان وە لەئەنجامدا دەبنە هۆی تێك دانی ڕیزی موسڵمانان چونکە وەکو هەر ڕێکخستنێکی کۆمەڵایەتی کەقیادەی کۆمەڵ بکات کاتێك هەندێك لەئەندامانی لەژێرەوە هەر کارێکی وابکەن کەبە پێچەوانەی پرۆگرامی ئەم قیادەیە بێت کە بۆ ڕێکخستنی ئەم کۆمەلەیەی دای داڕشتووە ئەوا ئەم قیادەیە دەکەوێتە مەتر سیەوە لەبەر ئەوەی لە (تصور)ی ئەم قیادەیەدا نییە کە ئەم کەسانە لەنێوان ڕێکخستنی دا هەیەو والێ هەڵدەگەڕێتەوەو ریزی قیادە تێك و پێك دەدەن وە لەئەنجامدا دەبنە سەرچاوەی زیان بۆ گشت ئەم پیلان و ڕێسایانەی کە قیاد بۆکۆمەڵی دارشتووە لەبەئەوەی هەموو بریارێك کەپەیوەندی

بەکۆمەڵەوە هەبێت لەقیادە دەردەچێت هەوەروەها بریاریش دەدات ئاخۆ چ بریارێك دەربچێت وە چی دەبێت بپارێزرێت وە بشاردرێتەوە وە هەموو ئەم شتانە کاردەکاتە سەر (معنویاتی) ئەم کۆمەڵەیە بەلەبەر ئەوەی تەنها قیادە دەتوانێت راستیو کاتی ترس و چۆنیەتی پاراستنی ئاسایش بزانێت و بێ پێوی بەگوێرەی ئەو زانیاریانەی کە دای ریشتووە بۆ ئەو مەبەستە.

وە ئیمرۆ چەندین شێوەو جۆرەها پیلانی منافقەکان دەبینین کە بەکاری دەهێنن بۆ شەڕ فرۆشتن و چاڵ هەڵکەنین بۆ کۆمەڵی موسڵمانان بەبێ سنوور و بە بەردەوامی بە هەموو شێوەیەك هەوڵدەدەن بگەنە هەموو بەشەکانی کۆمەڵ بۆ ئەوەی جۆرێك لە دوودڵی دروست بکەن بۆ موسڵمانان و باوەڕەکەیان لێ پیس بکەن بە جۆرێك لە هەندێك کات دا کار دەکاتە ئەوەی پەیام و کردەوە موسڵمانیەکان بکەنە خاڵی دەست پێکردن و پشت بەستن بۆ سەر لێشیواندنی کۆمەڵی موسڵمانییەتی.

خودای گەورەو میهرەبان لە قورئانی پیرۆزدا شێوەو رەوشتەکانی ئەو دووڕووو ناپاکانەی بۆمان روون کردۆتەوە بۆ ئەوەی لەکەس بزر نەبن وەهەموو خەڵك بیان ناسێ وە بۆ ئەوەی باوەڕداران و راست گۆیەکان تێی نەکەون ئاگاداریان دەکاتەوە لەم رەوشتە ناپاکە ئەمە لەلایەك و لەلایەکی تر مەبەست لە روون کردنەوەی رەوشتی ئەو کۆمەڵەیە بۆ رزگار بوون ی ئەو کەسانەیە کە بە نەزانی تێی کەوتوون تاوەکو داوای لێبووردن بکەن لە خودای گەورە کە دەفەرموێت:

﴿ ... أشحة علی الخیر أولئك لم یؤمنوا فأحبط الله أعمالهم وكان ذلك علی الله یسیرًا﴾ الحجرت: ١٩

خودای گەورە لەو ئایەتدەا رەوشتێك لە رەوشـتەكانی ئـەو دووروو ناپاكانـەمان بـۆ دیار دەكات كە ئەو كۆمەڵە زۆر رەزیلن لەسـەر چاكـە وە هیـچ لـە توانـاو سـامان و دارایی و شتی خۆیان بەخت ناكـەن بـۆ چاكـە لەگـەڵ ئـەوەش دا قسـەی درێـژو زل دەكـەن وە بێجگـە لـە زمـان درێـژی هیچـی تریـان لێنایـەت بـۆ چاكـە كـردن وە هۆیەكەشی دەگەرێتـەوە بـۆ باوەڕنـەهێنانیان بـە خـودای گـەورە و بـاوەر تێكـەڵی دڵنیان نەبووە لەبەر ئەمە خودای گەورە كردەوە چاكەكانیشی رەش كردۆتـەوە وە بەدیاری خست كە كردەوەكانیان وەرناگرێت لەبەر ئەوەی بۆ خودای گـەورە نـەیان كردووە بەڵكو لەبەر خەڵك كردوویانە وە ئەم كارەش لەسەر خودا ئاسـانە لـە هـەموو كاتێك دا كەدەفەرموێت:

﴿ذلك بأنهم اتبعوا ما أسخط الله وكرهوا رضوانه فأحبط أعمالهم﴾ محمد: ٢٨

واتە ئەم كۆمەڵە كاریان نەدەكرد بۆ رازی بوونی خودای گەورەو بەدوای ئەو شـتانە كەوتن كە بووە هۆی توڕەیی خودای گەورە لەبەر ئەوە خودای گەورە گشـت كـارە چاكەكانیان بەتاڵ كردوونەوەو سڕیەوە.

هەروەها پێغەمبەرمان (ﷺ) لە فـەرموودەكانیدا رەوشتەكانی ئـەم كۆمەڵـەمان بـۆ دیاری دەكات:

**(عن عبدالله بن عمر (رضي الله عنهما) قال: أن النبي (ﷺ) قال: اربع من كن فيـه كان منافقاً خالصاً او من كان فيه خصلة منهن كانت فيه خصلة مـن النفـاق حتـى يدعها اذا أؤتمن خان واذا حدث كذب و اذا عاهد غدر واذا خاصم فجر)**

رواه بخاري

واتە چوارشت هەیە هەر كەسێك ئـەم چـوار شـتەی لێ بێتـە جـێ ئـەوا (منافقـە) وە هەركەسێك تەنها یەكێك لەو شتانەی تێدا بێتە جێ ئـەوا رەوشـتێك لەرەوشـتەكانی

(منافقەکانی) تێدا بەدی دەکرێت هەتا وەکو وازی لێ دێنێت وە ئەو چوار شتەش ئەمانەیە:

١- ئەگەر ئەمانەتی لەلا بەجێ بهێنرێت خیانەتی لەگەڵ دا دەکات.

٢- ئەگەر قسەبکات درۆ لەگەڵ قسەکانیدا دەکات.

٣- ئەگەر وەعد بدات کەشتێك نەکات ئەوا وەعدەکەی بەجێ ناهێنێت و ئەنجامی دەدات و (غدر) بۆ خۆی دەهێنێتەوە.

٤- وەئەگەر بەشەڕ بێت لەمەودای شەرع دەردەچێت و هەموو شتێك ئەنجام دەدات و دەیکات لەو شەڕەدا.

**عن ابن عمر (رضي الله عنها) قال: رسول الله (ﷺ) : (ظهرت لهم الصلاة فقبلوها وخفيت لهم الزكاة فاكلوها، اولئك هم المنافقون)** متفق عليه.

ئەم فەرموودەیە ڕەوشتێکی تری ئەم کۆمەڵەیەمان بۆ بەدیاری دەکات کە نوێژ دەکەن لەبەر ئەوەی بەئاشکرا نوێژ دەبێ بکرێ بەڵام زەکات دان بەنادیاری ئەنجام دەدرێت ئەوانە زەکات نادەن و دەیخۆن.

کۆتای بەم بابەتە دەهێنین بەم ئایەتە کە خودای گەورە دەفەرموێت:

﴿ان المنافقين في الدرك الاسفل من النار ولن تجد لهم نصيراً . الا الذين تابوا واصلحوا واعتصموا بالله واخلصوا دينهم لله فاولئك مع المؤمنين وسوف يؤت الله المؤمنين اجراً عظيماً﴾ النساء: ١٤٥-١٤٦

ئەم ئایەتە یەکێك لەهەرە میهرەبانیەکانی خوداو لێ بووردنی بەرامبەر بەندەکەی بەدیار دەکات کە ئەم کۆمەڵەیە پاش ئەو هەموو خراپیو کردەوە نالەبارانەی کەئەنجامیان دەدەن خودای گەورە لێیان دەبوورێت بەچەند مەرجێك

١- تۆ بەبکەن و جارێکیتر نەگرێتەوە سەر ئەو خراپیانەی کەدەیان کرد.

٢-نیازو کردەوەکانیان چاك بکەن.

٣-دەستیان گرتبیّ بەپەیامی خوداو بەپێی ئەم پەیامە کاربکەن.

٤-هەموو کردەوەیەکیان تەنها لەبەر خودا بیکەن وهیچ نیازێکی تریان لێی نەبێت وەهەر کاتێك ئەو چوار مەرجەیان بەدەست هێنا ئەوا لەگەڵ بڕوا داران دەبن و بێگومان لەدا هاتوودا چ پاداشتێك دەدا بە بڕوا داران.

وە ئەم مەرجانەش شتێکی زۆر نیـیە ئەگەر بێت و بەراورد بکرێت بەو تاوانە گەورەیەی کە ئەنجامیان داوە و سڕینەوەی هەوڵ و تێکۆشانێکی تایبەتی دەوێت وخودای گەورە ئەوەشی نیشان دان ئەویش بەئەنجام دانی ئەو چوار مەرجە بەئومێدا ئەوەین کەهەر کەسێك ئەو ڕەوشتانەی لەخۆی بەدی دەکات خۆی پاك بکاتەوەو ئەو ڕێگایە بگرێتەبەرپێش ئەوەی لە ڕۆژی دوایی بکەونە بەشی هەرە ژێری دۆزەخ کەبە هیچ شتێك ئەو کاتی چارە سەری ناکرێت.

## ٣- واز لەنوێژ هێنان (ترك الصلاة)

سێیەم کردەوەیە لەو کردەوە لەناو بەرانەی کە دەبنە هۆی لەناو بردنی چاکە کەنمان هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ گرنگی نوێژ کردن کە بەدووەم بناغەی ئیسلام دادەنرێت وەیەکەم شتە کەلە ڕۆژی دوایدا پرسیارمان دەربارەی تیادا دەکرێت وەئەگەر بێت و لەو ڕزگار بین و دەرچووی ئەواڵ پرسینەوە کانی پاشتر زۆر باش دەبێت.

وەنوێژ یەکێکە لەواجبە فەرز کراواکانی سەر باوەڕداران کەدەبێت لەکاتی وساتی تایبەتی خۆیدا بەجێ بگەیندرێت وە بەهیچ جۆرێك نابێت پشت گوێ بخرێت کە دەفەرمووێت: ﴿ان الصلاة كانت على المؤمنين كتاباً موقوتاً﴾

ئەگەر بێت و سەیری کرداری نوێژ کردن بکەیت دەبینی بەکارێکی کۆمەلایەتی گرنگ هەڵدەستێ ئەگەر بەشێوەیەکی رێك وپێك ئەنجام بدرێت و رێك وبخرێت لەبەر ئەوەی لەهەموو گەرێکێك نزیکەی مزگەوتێك دەبینرێت بەلایەنی کەمەوە کاتێك کە باوەڕداران لە رۆژێك دا پێنج جار بانگ دەکرێن بۆ کۆبوونەوەو نوێژ کردن زیاتر پەیوەندیان بەیەکتریەوە دەبێت وە مەلای مزگەوت دەتوانێت بەکارێکی رێکخستنی کۆمەلایەتی هەلبستێت لەرێگەی باس کردنی باری ژیان و تەنگێشەی هەندێکیان کەلەژیانی رۆژانە تووشی دەبن وەئەگەر ئەم کەسە لەرۆژانە نەیتوانی لەهەر پێنج جار بچێت بۆ مزگەوت ئەوا لە کۆبوونەوەی گەورەتر کە کۆبوونەوەی هەینی‌یە باس لەباری ژیانی بکرێت و هاوکاری بکرێت بۆ چاك کردنی لەلایەن باوەڕداران لەسەر ئاستی گەرەکەکان وەپلە پلە تادەگاتە حەج کردن کەبەکرداری کۆبوونەوەی گەلان دادەنرێت بەشێوەی کۆمەڵ کۆمەڵ کەدەتوانرێن لەو کات دا باسی باری ژیانی گەلان بکرێت و داوای یارمەتی و هاوکاری لەگەلانی تر بکرێت لەبەر ئەمە دەتوانین بڵێین نوێژ بریتی‌یە لەو دیاری‌یەی کە خودای گەورەو میهرەبان پێشکەشی کردووە بەباوەڕدارەکان وەنوێژ وەکو پەیوەندی‌یەکی تەلەفۆنی وایە لەگەڵ خودای گەورە کە تۆ لەرۆژێك دا پێنج جار ئەوکارە دووبارە دەکەیتەوە لەچەند کاتێکی دیاری کراوداو لەبەرامبەر خودای گەورە دەوەستێت و پەیمان دووبارە دەکیتەوە داواشی لێ دەکەیت لەو شتانەی کە ناتوانیت ئەنجامی بدەیت کەبۆت ئاسان بکات.

وە پێش ئەوەی باسی نوێژ نەکردن بکەین وای بەباش دەزانم کە هەندێك لە گرنگی‌یەکانی نوێژ کردن باس بکەین.

## گرنگی نوێژ کردن:

**یەکەم:** یەکێك لەگرنگی‌یەکانی نوێژ کردن لەقورئانی پیرۆزدا ئامارەی بۆ کردووە ئەوەیە کە کردوویەتی‌یە بەڕەوشتێك لەڕەوشتەکانی باوەڕداران کە بەخاڵێکی جیاوازی داناوە لەگەڵ بێباوەڕەکان و دووڕووەکان دەفەرمووێت:

﴿الذین یؤمنون بالغیب ویقیمون الصلاة ومما رزقناهم ینفقون﴾ بقرة: ٣

وەگرنگی‌یەکی زیاتر بەدیار دەکات کەنابێت بەهیچ جۆرێك پشت گوێ بخرێت هەرچۆنێك بێت دەبێت بەجێ بگەیێندرێت ئەگەر تۆ لە سەفەر کردنیش دابیت یاخود لەکاتی شەڕ یان لەکاتی نەخۆشیش دابیت هەر دەبێت پارێزگاری لێ بکەی کەدەفەرمووێت.

﴿حافظوا علی الصلاة والصلاة الوسطی وقوموا لله قانتین﴾

بەجێ هێشتن وتەرك کردنی نوێژ لەڕەوشتی بێ باوەڕەکانە کە خودای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا بۆمان روون دەکاتەوەو دەری دەخات کەنوێژ نەکردن ئادەمیزاد دەباتە کۆمەڵی هاوبەش پەیدا کرەکان کە دەفەرموێت:

﴿واقیموا الصلاة ولاتکونوا من المشرکین﴾

هەروەها دەری دەخات کەکۆمەڵی دووڕووەکان (المنافقین) یەکێك لە ڕەوشتەکانیان ئەوەیە کە کاتێك بۆ نوێژ کردن هەڵدەستن بەتەمبەڵی و گرانایی هەڵدەستن کەدەفەرمووێت:

﴿ان المنافقین یخادعون الله وهو خادعهم واذا قاموا الی الصلاة قاموا کسالی﴾

**دووەم:** نوێژ کردن پەیوەندیە لەنێوان بەندەو خودادا وەدووبارە کردنەوەیەکی بەردەوامە بەبەندایەتی کردن بۆ خودای گەورە بەجۆرێك کەلەکاتی ئەنجام دانی‌دا دڵ و دەروون خاوێن دەکاتەوە بەجۆرێك والەئادەمیزادی بەباوەڕ دەکات لەکاتی دڵ

تەنگیدا کەپەرۆشی تێدا بێتەوەو لەخراپە کاری‌و نارەوا دووری دەکاتەوە ئەم گرنگی‌یەش بەقورئانی پیرۆزدا خودای گەورە ئامازەی پێ کردووە کە دەفەرموێت:

﴿یاایها الذین امنوا استعینوا بالصبر والصلاة ان اللّٰه مع الصابرین﴾ البقرة: ١٥٣

وەهەروەها دەفەرمووێت: ﴿واقم الصلاة ان الصلاة تنهی عن الفحشاء والمنکر﴾ العکبوت: ٤٥

**سێیەم:** نوێژ یەکەم کردەوەیە لەکردەوە خواپەرستی‌یەکاندا کە ئادەمیزاد دەبێت پێ‌ی هەلبستێ لەکاتی باوەڕهێنانی‌دا هەروەها بەهەمان شێوە بەیەکەم کردار دادەنرێت کەپێویستە ئەو کەسانەی کە دەگەڕێنەوە نێو موسڵمانیەتی‌و تۆبە دەکەن ئەنجامی بدەن پێش زەکات دان و خوا پەرستی یەکانی‌تر.

لێرە پرسیارێك دێتە پێشەوە ئەویش ئایا بۆچی نوێژ پێش زەکات دان خستراوە؟

لەوەڵام دا لەبەر ئەوەی زەکات دان مەرجی تایبەتی خۆی هەیە وە لە ساڵێك دا تەنها یەك جار لەسەر مایەی خاوەنەکەی وەردەگرێت وەئەگەر بێت و زەکات پێش بخسترابووایە دەبوایە ئێمە بوەستین لەسەر ئەوکەسانەی کە باوەڕیان بەئاینی موسڵمانان کردوە تاوەکو زەکات دەدەن بۆ ئەوەی بزانێت ئایا رێگای راستی گرتووە یان بەناو باوەڕی هێناوە بەڵکو نوێژ باشترین بەڵگەیە لەسەر راستگۆیی ئەو کەسانە.

ئەمە لەلایەك لەلایەکی‌دیەکەدا نوێژ کردن کارێکی رۆژانەیەو مرۆڤ پێنج جار پێ‌ی هەڵدەستێ بەڵام زەکات دان لەپارەو سەرمایە دەبێت تەنها یەك جار لەساڵێك دا وە وەپارەش لە کاری رۆژانە پەیدا دەبێت وە گرنگی وگەورەیی نوێژ لێرەدا بەدیار دەکەوێت کەتۆ قوربانی بەوکاتە دەدەی کەلەو رۆژانە دەبیتە سەر بۆ نوێژ کردن و بۆیە نوێژ کردن پێش زەکات خستراوە کەدەفەرمووێت:

﴿فان تابوا واقاموا الصلاة وآتوا الزكاة فاخوانكم في الدين ونفصل الايت لقوم يعلمون﴾ التوبة: ١١

ئەوەی باسمان کرد چەند نموونەیەك بوو کەلە قورئانی پیرۆزدا باس لەگرنگی نوێژ دەکات لەژیانی رۆژانەی ئادەمیزادو لەژیانی کۆتاییدا.

هەروەها لەفەرموودەکانی پێغەمبەریش (ﷺ) چەند نموونەیەك دەهێنینەوە بۆ ئەوەی زیاتر بتوانین لەگرنگی نوێژ بگەیین و بزانین پاداشتی کردن و سزای واز لێ هێنانی چییە.

**عن ابي هريرة: (رضي الله عنه) عن النبي (ﷺ): قال: الصلوات خمس والجمعة الى الجمعة كفارات لما بينهن مالم تغش الكبائر)** رواه مسلم والترمذي.

واتە هەر پێنج نوێژەکان ونوێژی هەینی تا ئەو هەینی دەبن بەکەفارەتی ئەو گوناهانەی کە لەنێوانیان دا دەکرێن بەمەرجێك گوناهی گەورە نەبن.

**عن ثوبان (رض الله عنه): عن النبي (ﷺ) قال: عليك بكثرة السجود لله فانك لاتسجد لله سجدة الا رفعك الله بها درجة وحط عنك بها خطيئة)**

رواه مسلم والترمذي.

واتە هەتا دەتوانین نوێژێکی زۆرو بێ شومار بکە بۆ خودا چونکە هەموو جارێك کە کرنووش بۆ خودا دەبەیت خودا یەك پایە بەرزت دەکاتەوەو یەك گوناهیشت بۆ دەسرێتەوە.

**(عن ابي قتادة (رضي الله عنه) عن النبي (ﷺ) قال: قال الله تعالى عزّ وجلّ: إني افترضت على أمتك خمس صلوات وعهدتُ عهداً عندي انه من جاء يحافظ عليهن لوقتهن ادخلته الجنة ومن لم يحافظ عليهن فلا عهد له عندي)** رواه ابو داود

پێغەمبەرمان (ﷺ) لە خودای گەورەو میهرەبانەوە بۆمـان دەگێڕێتـەوە کـە خـودای گەورە دەفەرموێت: من پێنج نوێژم لەسەر گەلی تۆ داناوە، وە پەیمانیشم کردووە لەگەڵ خۆم دا کە هەر کەسێك بەرێك و پێکی لە کات و ساتی خۆیدا بیان کات ئـەوا دیبەمە بەهەشت وەهەر کەسێك ئاگاداریـان نـەکات ئـەوا هیـچ پـەیمان و بـەڵێنێکی لەسەر من نی یە.

هـەروەها لـەکردەوەکانی پێغەمبـەر (ﷺ) کـە ئـەنجامی دەداو گرنگـی نوێـژ کردنـی بۆمان بەدیار دەخست دەگێرنەوە کە لەکاتی دڵتەنگی دا داوای لەبلال کـردووە کـە بانگ بدات بۆ نوێژ کردن هەروەها لـە هـەرکاتێك کـە کـارێکی بـهات بایـە پێشـەوەو لەبەری نەڕۆشیتبایە هەڵ دەستا نوێژی دەکرد بۆ ئەوەی کارەکەی بۆ ئاسان بێت.

## واز لەنوێژهێنان

لەبەر گرنگی نوێژ لەلایەك و لەلایەکی دیکە وەکـو باسمـان کـرد کـە (رخصـەت)لـە هـەموو جۆرەکـانی خواپەرستی هەیـە تەنـها لـەنوێژ کـردن دا نـەبێت بۆیـە بـەجێ هێشتنی و نـەکردنی نوێـژ کـارێکی زۆر گەورەیـە وەدەبێتـە هـۆی ڕەش بوونـەوەی کردەوە چاکەکانی خاوەنەوەکەی.

پێغەمبـەرمان (ﷺ) سەبارەت بـەنوێژ زۆر بـەتووندی باسـی ئـەم کـردەوە خراپـەی کردووە کە دەفەرموێت: **(العهد الذي بيننا وبينهم الصلاة فمن تركهافقد كفر)**

واتە: ئەو سنوورەی لەنێوان باوەڕدارو بێ باوەڕان دا هەیـە نوێـژە وەهەرکەسێك بەجێی بهێلێت کافر دەبێت وە هەر کەسێك نوێـژ نـەکات وە باوریشـی پـێ نـەبێت بـەکافر دادەنرێت واتـە جیـاوازی لـەنێوان موسڵمان و کـافر نوێـژە کەیـە ئـەگــەر نوێژەکەت.نەکرد لەخۆت بترسێ لەکفر.

چونکە بەڕاستی نوێژ بەڵگەی بەندایەتی تۆیە بۆ خـوادای گـەورەو میـهرەبان جائەوەی لەنوێژ دوور کەوتەوە واتە لە موسڵمانەتی دوور کەوتۆتـەوە چونکە نوێـژ نـەکردن واتـە رازی نـەبوون نەبـە پـەیامی خـوداو رازی نـەبوون بەبەندایـەتی خـودا چونکە ئەگەر تۆ رازی نەبوویت نێوچەوانی خۆت بۆ خـودا دابنێیت واتـە تـۆ خـۆت بەگەورە دەزانیـت بەرامبـەر بـەخوداو تـۆ خـودا بەشـایەنی ئـەوە نـازانی کـەنوێژی بۆبکەیت هەر بـۆ یەشـە خـودای گـەورەو میهرەبان نوێـژ کـردن دەکاتـە نیشـانەی بەندایەتی وە دەفەرموێت: ﴿قل لعبادي الذين امنوا يقموا الصلاة﴾ ابراهيم: ٣١ واتە ئەی محمد (ﷺ) بڵێ بەو بەندانەی مـن کـە باوەڕیـان هێنـاوە بـانوێژ بکـەن بـۆ ئەوەی ببێتەنیشانەی بەندایەتی بۆ من.

وەنوێژ کردن پەیوەندی تۆ بۆ کۆمەڵی موسڵمانان بەدیار دەخات چونکە ئەگەر تۆ بـەزمان هـەر بڵـێی مـن موسـڵمانم هیـچ بەکەڵك نایـەت ئەگـەر تـۆ نوێـژ نەکـەی و (هوية)ی موسـڵمانیت وەر نـەگریت چونکـە نوێـژ کـردن بەرەگەزنامـەی موسـڵمانان دادەنرێت چۆن تۆ کەدەچیتە هەر شوێنێك وە بۆ ئـەوەی لـەو شـوێنە بناسـرێیت و بەدیار بکەوی کەسەر بـەچ وڵاتێکی پێویسـت بەهـەلگرتنی ڕەگەزنامـە هەیـەو ئـەو زانیارە پێویستانەی تیادا بـەدیار دەخرێت بەهـەمان شێوە نوێـژ کـردن نیشـانەی ئەوەیە کەتۆ ئادەمیزادێکی بەسوودی کۆمەڵی موسڵمانانی.

وەئەوەی بەبەردەوامی نوێژەکانی ئەنجام بدات بـەبێ کـەم وکـوڕی و بەتـەواوی بـۆ خودای گەورەو میهرەبان ئەنجامی بدات بزانە چۆن بۆی دەبێتە ڕووناکی و خۆشـی و شادی، بزانە چۆن پێغەمبەر (ﷺ) کەباسی نوێژ دەکات دەفەرموێت: **(من حـافظ عليها كانت له نوراً وبرهاناً ونجاتاً يوم القيامة ومن لم يحافظ عليها)** رواه الطبراني.

واتە ئەوەی بەردەوام بێت لەسەر نوێژەکانی و بەتەواوی بیکات بۆ خودا بەنیازێکی ساف نەك بۆ ریابازی بیکات ئەوا بۆی دەبێتە ترسکاییو ڕووناکیۆ وەرزگاری دەبێت لەئاگری دۆزەخ.

وە ئەوەی پارێزگاری لەسەر نەکات لەدینادا تیرسکایو ڕووناکی لەسەر دەمو چاوی نابینیۆ وەهیچ کەلکێکی نی یە کەبڵێ من موسڵمانم و رزگاریشی نابێت لەگورەپانی ڕۆژی دوایی‌دا.

هەر دەربارەی ئەو بابەتە خودای گەورە باسی نوێژ کەران دەکات کە ئاگاداری نوێژەکانی خۆیان نین کە دەفەرمووێت.

﴿فويل للمصلين ، الذين هم عن صلاتهم ساهون﴾ الماعون: ٤،٥

زاناکان زۆر بەیان دەفەرموون کە (ویل) ناوی شوێنێکی زۆر گەرم وناخۆشە لەئاگری دۆزەخ.

وەمانای ئەم ئایەتە بەم شێوەیە واتە زۆر ناخۆشیو ناهەمواری بۆ ئەو نوێژ کەرانەی کەئاگاداری نوێژەکانیان نین لەکاتی خۆیان ئەنجام نادەن.

ئینجا ئەگەر نوێژ کەرێك کەنوێژێك بکات و دووان نەکات یان نوێژەکانیان بەدوادەخەن و لەکاتی خۆیان ناکەن ئەو هەموو ناخۆشی‌یەی هەبێت ئەدی ئەوەی کە هەر نوێژ ناکات دەبێت چ ئازارێکی هەبێت هەروەها دەفەرموێت:

﴿فخلف من بعدهم خلف اضاعوا الصلاة واتبعوا الشهوات فسوف يلقون غياً﴾

مريم: ٥٩

واتە ئەو پیاو چاکانەی ئەوەی وایان لێ پەیدا بوو کەئاگاداریان لەنوێژەکانیان نەدەکرد لەجیاتی نوێژ کردن کەوتن دوای (شهواتی خۆیان ئەمانە سەر شۆڕی دنیاو قیامەتن وە دۆزەخ چاوەڕوانیان دەکات.

## جیاوازی نێوان نوێژ کردن ونوێژ نەکردن دا :

خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿افنجعل المسلمین کالمجرمین مالکم کیف تحکمون﴾

**القلم: ٣٥**

**واتە ئایا حسابی موسڵمانان و حسابی تاوانباران وەکو یەکە لەحیساب کردن دا نەخێر ئەمەش هەر گیز نابێت، هەروەها دەفەرموێت.**

﴿کل نفس بما کسبت رهینة الا اصحاب الیمین فی جنات یتسالون عن المجرمین ، ماسلککم فی سقر قالوالم نك من المصلین ولم نك نطعم المسکین وکنا نخوض مع الخائضین﴾ المدثر:

**واتە هەرکەسێك بەرپسیارە لەخۆی وەبەهەشتیەکان سەیری ئەو کەسانە دەکەن کەلە دۆزەخ دان وە لەو تاوانبارانە دەپرسن کەچی ئێوەی توشی دۆزەخ کرد؟ ئەوانیش وەڵام دەدەنەوە کە یەکەم هۆی تووش بوونیان ئەوە بوو کەنوێژیان نەکرد.**

**بابزانن ئەو کەسانەی کەنوێژ ناکەن کەخودای گەورە بەتاوانبار ناویان دەبات و هەر بۆیەش کوشتن شایەنی ئەو نوێژ نەکەرانەیە کە کۆڵەگەی باوەڕیان شکاندووە.**

**وەهەر کەسێك کە نوێژ نەکات دەچێتە دەرەوەی کۆمەڵی موسڵمانان وهیچ پەیوەندیەکی بەو کۆمەڵە نامێنێت وە بەڵگەشمان لەسەر ئەوە فەرمودەی پێغەمبەرە (ﷺ) کەدەفەرموێت:**

**(لتنقضن عروة الاسلامی عروة عروة فکلما تنقض عروة یثبت الناس بالتي یلیها فاولها نقضا ، الحکم وآخرها الصلاة)**

**واتە ئێمە کە موسڵمانین موسڵمانێتی بەئێمە گرێ دراوە بەچەند گرێیەك وەئەو موسڵمانە چەند لەو موسڵمانیەتی دوور بکەوێتە ئەو گرێیانە یەك یەك دەکرێتەوە**

وەیەکەم گرێ کەدەکرێتەوە بریتی‌یە لە کار نەکردن بەقورئان وە هەر گرێ یەك کەدەکرێتەوە موسڵمان پووەکاتە گرێ یەکی‌تر تاوەکو خۆی پێوە بگرێت وە هەرە کۆتایی گرێ کەخۆی پێوە بگرێت نوێژە.

لێرەدا بۆمان روون دەبێتەوە کە ئەگەر بێت و نوێژ نەکەی واتە هیچ شتێك نەماوە لەموسڵمانیەتی کەخۆی پێوە بگرێت وەبەم جۆرە لەکۆمەڵی باوەڕداران دەچێتە دەرەوە، بەڵێ نوێژ کردن ئاخیر گرێیە کەبت بەستێتەوە بەموسڵمانیەتی لێرەدا لەو باسانەی کە باسمان کرد دەگەینە بنچینەیەك ئەویش نوێژ کردن بەرزترین پلەی بەندایەتی‌یەو نوێژ نەکردن نزمترین و گەورەترین پلەی دڵ رەقی‌یە.

بەڵێ نوێژ نەکردن ئەو پەڕی دڵ رەقی‌یە ئەدی چۆن تۆکە خودای گەورە رۆژی پێنج جار بانگ دەکات بۆماڵی خۆی وەڵامی نادەیتەوە ئەو خودایەی کەهەردەم دەرگای ماڵی لەسەر پشتەو هەرگیز دیناخات؟

لێرەدا دەمەوێ ئەم وێنەیە بخەمەپێش خوێنەری بەباوەڕ ئەویش ئەو نموونەیە کەزۆر لەژیانی رۆژانە دێتە پێش چاومان کە کاتێك تۆ کارێکت بەسەرۆکی وڵات هەبێت چۆن یەکەم جار داواکاری پێشکەش دەکەی بەدیوانی سەرۆك ئنجا ئایا داواکارکەت وەردەگرێت و مەقبوول دەکرێت یان ڕەت دەکرێتەوە وە ئەگەر قبوول کرا کارەکەت بۆ دەکات یان قبوولی ناکات وەچەندین پرسیارو وەڵامی تر لەو کارە دێتە پێشەوە بەڵام کە سەیری ئەم خودایە گەورەیە دەکەیت هەردەم لەبەندەی خۆی بی ئاگا نابێت و هەرکاتێك رووی تێ بکەی و داوای لێ بکەی لێت خۆش دەبێت ئایا ئەو خودایە شایستەی ئەوە نی‌یە کەتۆ بە دوای داواکاری برۆی و نوێژی بۆ بکەی هەر لەم بارەوە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت:

**(الجفاء كل الجفاء والكفر والنفاق لمن سمع منادي الله ينادي فلا يجيبه)** رواه احمد

واتە ئەو پەڕی دڵ ڕەقیو بێ باوەڕیو ناپاکی نیشانەکەی ئەوەیەکە بانگکەری خودا بانگ دەکات بۆ نوێژ کردن وەتۆ وەڵامی نادەیتەوە.

ئایا خودا کە تۆ دەعوەت دەکات بۆماڵی خۆی لەرۆژێك دا پێنج جار تۆ چۆن وەڵامی نادەیتەوە بەڵام ئەگەر برادەرێکت دەعوەتت بکات وەڵامی دەدەیتەوەو دەڵێی ئەگەر نەچم توورە دەبێت ئایا خودای گەورەش تورە نابێت کەتۆ وەڵامی دەعوەتەکەی نەدەیتەوە وەتۆ شایستەی ئەوە نیت کەپێت بڵێت تاوانبار.

## ئەنجامی نوێژ نەکردن:

لێرەدا باسی دوا رۆژو دەرئەنجامی ئەو کەسانە دەکەین کەنوێژ ناکەن و بەجێی دەهێلن خراپترین ئەنجام کەخودای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا باسی کردووە ئەوەیە دەفەرمووێت کە دەفەرمووێتك:﴿وقال ربكم ادعوني استجب لكم ان الذين يستكبرون عن عبادتي سيدخلون جهنم داخرين﴾ غافر: ٦

واتە داوام لێ بکەن منیش بۆتان جێبەجێ دەکەم وەهەر کەسێك خۆی لەوەبە گەورەتر بزانێ کەسەر بۆمن دابنێت من بەسەر شۆڕی فڕێی دەدەمە ناو دۆزەخەوە.

دەرئەنجامی دووەم بریتییە لەرەش بوونەوەی گشت کارە چاکەکانی ئەوکەسەی کە نوێژ بەجێ ناگەنێت کەپێشترو لە داهاتوو ئەنجامی داوە ئەگەر بێت و هەر لەسەر کارەکەی خۆی بەردەوام بێت و نوێژ نەکات.

**عن ابن عمر (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (ﷺ): (من ترك الصلاة العصر حبط عمله)** رواه بخاري.

واتە هەر کەسێك نوێژ (عصر) بەجێ نەگەیێنێت و ئەنجامی نەدات دەبێتە هۆی لەناو چوون ورەش بوونەوەی گشت کردەوە چاکەکانی.

باشە ئەوا ئەو کەسەی کە نوێژی (عصر)ی نەکردووە کەواتە ئەوەی کەهەر نوێژ ناکات بێ گومان دەبێتە هۆی ڕەش بوونەوەی کردەوە چاکەکانی تری.

سێیەم: چۆنیەتی وەڵام دانەوەیان لەرۆژی دوایی کەچۆن پرسیاریان لێ دەکرێت و ناتوانن وەڵام بدەنەوە کە دەفەرموێت:

﴿يوم يكشف عن ساق ويدعون الى السجود فلا يستطيعون، خاشعة ابصارهم ترهقهم ذلة وقد كانوا يدعون الى السجود وهم سالمون﴾ القلم: ٤٢-٤٣

لەدەربارەی ئەم ئایەتە باوکی سەعیدی خدری (رضـي الله عنـه) ئەفەرموێت کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:

**(يكشف ربنا عن ساق فيسجد له كل مؤمنة ومؤنه و يبقى من كان يسجد في الدنيا رياءً وسمعتاً فيذهب ليسجد فيعود ظهره طبقاً واحداً)** رواه البخاري ومسلم.

واتە لەرۆژی دوایی‌دا خودای گەورە لاقی خۆی نیشان بەموسڵمانان دەدات (لاقی خودا چۆنە هەر خۆی دەزانی ئەوە لەزانینی کەس دانی‌یە) وەهەر کەسێك کەباوەڕی هێنا بێت بەخودا کرنۆش دەبات بۆی تەنها ئەو کەسانەی کە نوێژیان نەدەکرد یان نوێژەکانیان لەبەر خەڵك دەکرد بۆریابازی بووە ناتوانن کرنۆش ببەن چونکە لەشیان هەموو لەوکاتەدا ڕەق دەبێت دەرئەنجامی چوارەم موسڵمان کاتێك کەهەڵدەستێت بۆ نوێژ کردن و ڕوو لەخوا کردن وە لەو کاتەدا چەندین کاری جۆراو جۆر لەمێشکی دا کۆدەبێتەوەو بیری لێ دەکاتەوە وەکو بڵێی ئەوکاتە کاتی بیرکردنەوەیە بۆیە پێویستە هەوڵ بدات ئەم کارە دوابخات بۆ دوای نوێژ کردن ئەویش لەبەر دوو هۆ:

**یەکەمیان**: بۆ ئەوەی بتوانێ بەتەواوەتی بەندایەتی خودای گەورەبکات و نوێژەکەی بەرێك وپێکی ئەنجام بدات.

**دووەمیان:** نوێژ کردن ئەو مێژەیە کە دەبێتە هۆی ساف بوونی مێشک لەوکاتەی کەنوێژ ئەنجام دەدەی بەمەرجێك تەنها بیر لە خودای گەورە بکەیتەوەو وادبنێیت کەخودای گەورە لەگەڵ تۆ دەدوێت و تۆ وەلامی دەدەیتەوە وەبەم شێوەیە دەتوانی پاش نوێژ کردن بیر لەو کارانە بکەیتەوە کەپێش نوێژ کردن خەریکی بووی وە سەربکەوی لەبرپاردانی بریاری بەسوود وەلە هەموو کارەکانی رۆژانەت سەربکەوی لەرۆژی دوایی دا بەهەمان شێوە سەردەکەوی کە خودای گەورە دەفەرموێت:

﴿قد افلح المؤمنون الذين هم في صلاتهم خاشعون﴾ المؤمن: ١

بۆیە موسڵمانینە هەر چەندە بتوانین پێویستە پارێزگاری لەنوێژەکانمان بکەین بۆ ئەوەی ببێتە پالپشتێك بۆ رێکخستنی کارەکانی تری رۆژانەمان جاچ دەربارەی خواپەرستی بێت یاخود دەربارەی ئیش کردن وپەیوەندییەکانی تر بێت.

## باسی دووەم: کارڵی کەرەکان:

کارڵی کەرەکان بریتین لەو کردەوانەی کە دەبنە هۆی کەم کردنەوەی هەندێك لەو کردەوە چاکانەی کە ئەنجامی دەدەین لەپێش ئەنجام دانی ئەم کردەوانەدا وە ئەم کارڵی کەرانە لەلایەکی ترەوە دەبنە هۆی پەیدا کردنی دووبەرەکی و ئاژاوە لەنێو کۆمەڵ داو لەکاتی ئەنجام دانیان دا.

**وەچوار کردەوە دەگرێتەوە کەبریتین لە :**

**١- داهێنانی کردەوەیەك (البدعە).**

**٢- ریابازی (الریا)**

**٣- منەت و ئازاردان لەکاتی خێرکردن دا (المن بالصدقە).**

**٤- ئازاردانی دایك وباوك.**

وەبەپشتیوانی خودای گەورە ومیهرەبان هەندێك باسی ئەم کردەوانەی دەکەین بەپێی قورئانی پیرۆز فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بێت.

**١-البدعە:**

کردەوەی چاك ئەوکردەوەیە کە لە دڵەوەو بەڕاستی بۆ خودای گەورەو میهرەبان بێت وە ڕاستیش دەبێت کاتێك بەپێی پەیامی خودا بێت بۆیە هەر زیادیەك یان کەم کردنەوەیەك لەئایین دانابێت ڕووبدات وەپاداشت بۆ خاوەنەکەی نانوسرێت هەرچەندە بەنیازی خواپەرستنی خوداش ئەنجامی دابێت.

(بدعە) خراپترین بەرەنگار بوونەوەی ئایینە ئەمەش لەبەر ئەوەی داهێنانی هەر پیتێك لەبارەی ئایین دەبێتە هۆی گۆڕینی ئایین بەجۆرێك بەو کارە تاوانباری دەکەی بەکەم وکوڕی یان بەوەی کەئایین پێویستی بەتەواو کاریو چاك کردن هەیە ئەمەش کارێکی گەورەیەو بەهیچ جۆرێك دروست نییە وەلەم بارەیەوە پێغەمبەر (ﷺ) ئاگادارمان دەکاتەوە کە دەفەرموێت:

**(ایاکم و محدثات الامور فان کل محدثة بدعة وکل بدعة ضلالة وکل ضلالة في النار)**

**البدعە:** بریتییە لە دارشتنی یان داهێنانی کردەوەیێك یان قسەیێك کە نەگەوێتە ژێر بنچینەیەك لەبنچینە گشتییەکانی (ئیسلام) کە لەقورئان و سوننەت و (اجماع وقیاس) باس کراوە یان لەگەڵ ئەم بنچینانە نەگونجێت.

وە بەپێی ئەم پێناسەیە دەتوانین بڵێین هەر شتێکی تازە کە پەیوەندی بەئایینی ئیسلامەوە هەبێت ئینجا (چ دەربارەی خواپەرستی یاخود کاروکردەوە بێت) سەیری دەکەین تاوەکو بزانین ئایا لەگەڵ بنچینەکانی ئیسلام دەگونجێ یان ناگونجێت ئەگەر لەگەڵی دارێك کەوت ئەوا بەبدعە دانانرێت بەڵام ئەگەر لەگەڵیدا نەگوتجێت بەبیدعە دادەنرێت و لەخاوەنەکەی وەرناگیرێت.

**عن ام المؤمنين ام عبدالله عائيشة (رضي الله عنه) عنهما قال رسول الله (ﷺ) من احدث في امرنا هذا ماليس منه فهو رد)** رواه بخاري ومسلم

واتە هەرکەسێك هەر دیاریدەیەك پەیدا بکات لەکاروباری موسڵمانیەتی دا وەئەم شتە زیادەیە پەیوەندی بەئایینەوە نەبێت ئەوا لێی وەرناگیرێت وە ئەدرێتەوە بەسەریەوە.

واتە پێویستە لەسەر هەر موسڵمانێك کە کردەوەیەکی ئایینی ئەنجام دەدات پێویستە ئەم کردەوەیە فەرمانی خودای گەورەو پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر درا بێت ئەگەر نا لێی وەرناگیرێت.

بەواتایەکی تر ئەو کردەوەیە ناکەوێتە ژێر بنچینە گشتیەکانی موسڵمانیەتی بۆیە لێت وەرناگیرێت وەبۆت بەچاکە نانوسرێت وە دەدرێتەوە بەسەرت دا.

بۆ نموونە تۆ لەکاتێکی تایبەتیدا نوێژێك بکەی کە لە (شەرعا) باس نەکرابێت یان شێوەی خواپەرستی بگۆڕیْ بۆ شێوەیەکیتر بەشێوەیەك کەمی بکەی یان زیادی بکەی ئینجا چ لەژمارەی کرنۆش بردن یان شێوەکانی تریێت وەنموونە زۆرە لەسەر بیدعە بەژمارە ناچێت.

هەروەکو چۆن ئیمرۆ لەژیانی رۆژانەماندا دەبینین چەندین جۆر رێگەی ناتەواو بەکار دێن بۆ کرین و فرۆشتن وەچەندین ناویان داهێناوە بۆ (ریبا) کردن بەناوی کرین و فرۆشتن وە بەوناوە بریقەدارانە خۆیان لەرێگەی راست دوور خستۆتەوە

وەئەم کردەوانەش گشتیان دەرچوونە لەرێبازی موسڵمانیەتی وە خاوەنەکەی سزا دەدرێت.

ئینجا براو خوشکی موسڵمان ئێمەی موسڵمان کەسەیری ژیانی رۆژانەمان دەکەین دەبینین چەندین ئەگەر (پرسیار) دێتە پێشمانەوە سەبارەت بە (بیدعە) وەچەندین شتی باش ناو دەنێین (بیدعە).

ئەمەش بەهۆی نەزانینە یان بەهۆی نیاز خراپیە لەلایەن هەندێك کەسەوە بەرامبەر بەموسڵمانیەتی بۆ ئەوەی چەند خاڵێکی (سلبی) لەئایینی تەواوی ئیسلام بروست بکەن هەندێکیان بووە بەچەکێك بە دەست دوژمنانی ئیسلام وە دژبەموسڵمانان بەکاری دەهێنن لەکۆرو مناقشە ئایینی‌یەکان دا بەڵێ ئەو چەکانەی دوژمنانی ئیسلام دژی موسڵمانان بەکاری دەهێنن بریتی‌یە لەم چەند ووشەیەی کە بەهۆی نەزانی‌و هەندێك جار بەهۆی توونـد رەوی دروستمان کردووە وەلەگەڵ یەکتردا سەبارەت بەم شتانە مناقشەی بێ سوود دەکەین وە بە ئاشکرا بەرامبەر یەکتر رادەوەستین و دەیخەینە پێش دوژنمان وە ئەمەگشتی دەبێتە هۆی لەیەکتر دابرانی موسڵمانان و لەیەکتر ترازانیان بەجۆرێك کەببن بەچەند بەشێکی جیاواز.

**عن ابن مسعود (رضي الله عنه): قال:هلك المتنطعون قالها ثلاثا.** رواه مسلم

وە ئەم جۆرە خاڵانە دێنە ئاراوە بەهۆی ئەو هەموو پرسیارو بێ سوودانەی کە دەکرێن لەلایەن موسڵمانانەوە سەبارەت بەموسڵمانیەتی کەهەندێك جار پرسیار لەشتی زۆر سەیر دەکەن کە چەندین پرسیاری بەدوا دادێت...؟!

وە بۆ ئەم مەبەستەزانایانی ئایینی ئیسلام چەندین بنچینەیان دارشتووە کەلە قورئان و سوننەتەوە دەریان هێناوە و پشتی پێ بەستراوە لەوانەش:

١-الاصل في الاشياء الاباحة مالم يثبت النهي عنها.

٢-الاصل في الشياء الحل مالم تثبت حرمتها.

واتە هەموو شتێك وە هەموو کردارێك لەبنەرت دا دروستەو حەلاَڵە ئەگەر بێت و بەبەڵگەی دەقێك قەدەغە نەکرابێ یان حەرام نەکرابێ.

بۆیە پێویستە هەر شتێك کە ڕوویدات یان بێتە پێشمانەوە سەیر بکرێ بۆ ئەوەی بزانرێ ئایا ئەم ڕووداوە کردارە دەکەوێتە ژێر بنچینەیەك لەبنچینە شەرعی‌یەکان ئەگەر وابوو ئەوا دروستەو حەلاڵە بەلاّم بەپێچەوانەوە واتە ئەگەر نەکەوێتە ژێر ئەم بنچینانە بیدعەیەو دروست نی‌یە.

واتە مەرج نی‌یە هەر شتێك کەلەسەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) نەکرابێ یان فەرموودەی لەسەر نەبێ پێی بگوترێ (بیدعە) لەبەر ئەوەی نەکردنێ یان نەگوتنی شتێك لەلایەن پێغەمبەر (ﷺ) نابێتە بەڵگەی سُونتەت بۆ ئەو شتە هەروەها ناش بێتە بەڵگە بۆ دروست نەبوون و حەرام کردنی بەڵکو پێویستە لە دوای دا بگەرێین لەبەشەکانی ئایین داکە (اجماع و قیاس)ە هەردەربارەی پرسیار کردنی بی‌سوود پێغەمبەرمان (ﷺ) بۆمان ڕوون دەکاتەوە خراپی ئەو کردارەو دوا ڕۆژی ئەو کەسانەمان بۆ دیاری دەکات کەبەو کردارە هەڵدەستن.

**عن ابي هريرة (رضي الله عنه): قال سمعت رسول الله (ﷺ) يقول مانهيتكم عنه فاجتنبوه وما امرتكم به فاتوا به ما استطعتم فانما اهلك الذين قبلكم من كثرة مسائلهم واختلافهم على انبيائهم.** رواه بخاري ومسلم

واتە هەر چیم لەئێوە قەدەغەکرد مەیکەن و خۆتان لێی بپارێزن وەهەرچی فەرمانی پێ کردنیشم پێدان هەرچەندی لەتواناتان دا هەیە بیکەن، وەنەتەوەکانی پێش ئێوە لەبەر ئەوە خودا لەناوی بردن چونکە بەبێ پێویست پرسیاری زۆر بێ سوودیان لەپێغەمبەران دەکرد هەروەها دژ بەفەرمانی پێغەمبەران دەجولانەوە.

وەمەبەست لەپرسیاری بێ سوود ئەوپرسیارانەیە کە لەبابەتی بێ کەڵك دەکرێن دەربارەی ئایینەوە بەجۆرێك کە ئەم پرسیارانە تەنها خاڵی جیاوازی دروست

دەكات لەنێوان موسـڵمانان و هیچی تـر نـا هـەروەها پرسیار دەكـەن هـەندێك كـە (صدق الله العظیم) بیدعەیە یان نەء وەگشت دەبنـە هـۆی مشـغول كردنـی كۆمـەڵی موسـڵمانان بـەم پرسیارانەو لەئـەنجام دا بـەرەو پـاش چوونـی ئـەم كۆمەڵـە رۆژ بەدوای رۆژ چونكە ئەم پرسیارانە دەبێتە هۆی جیـاواز بوونـی كۆمـەڵی موسـڵمانان وەلەیەك ترازانیان ویەك نەگرتنیان لەبەر ئەوەی هەر كۆمەڵێك بەیەك گرتنـی گشـت چین و توێژەكـانی سـەر دەكـەێت و پێش دەكـەوێت وەئەمـەش لـەئامۆژگاری و داواكاری خودای گەورەیە كە دەفەرمووێت:

﴿یاایها الذین امنوا اصبروا وصابروا ورابطوا واتقوا الله لعلكم تفلحون﴾

آل عمران: ٢٠٠

واتە ئەی ئەوكەسانەی كەباوەڕتان هێناوە خۆگرین لەسەر چەند شتی زۆر كەدێتـە رێتان و دووچاری دەبن لەسـەر هـەموو رووداوو بەسـەر هـاتێكی نـاخۆش و ئێش و ئازاردەر وەبەر بەرەكانی بكەن و نەبـەزن لـەخۆگرییدا نەلەبەرامبـەر بەسـەرهات و رووداوی سەخت نەبەرمبەر دوژمن كـە بەهـەموو هێزیـان دەیانـەوێ لـەناوتان ببـەن وەنیشـتـەجێ ودامـەزراوبن لەهەرجێگایـەك لەسـەر سـنووری وڵات وەبـەووریاو ئامادەیی بن بۆ بەرپەرچ كردن و بەرگری دوژمن وەخۆتـان بپـارێزن لەسزای خـودا بـەڵكو بكـەن بـە ئامـانج و مەبەستتان، بـەڵێ ئەمـە ئامۆژگـاری خـودای گـەورەو میهرەبانە بۆ كۆمەڵی موسڵمانان.

## چەند نموونەیەك لەو پرسیارانەی كە دەكرێن سەبارەت بەبیدعە:

لێرەدا چەند نموونەیەك لەوخاڵانە باس دەكـەین كەمێشكی هـەندێك لەموسـڵمانانی پێوە خەریك بووەو هەندێكیان زۆر بەتووندی سەیری ئەم كرەوانە دەكەن كەوە كو

بەبەرستێك دێتە پێش چاویان وهەردەم مناقشە لەگەڵ موسڵمانەكانی تر دەربارەی ئەم كردەوانە دەكەن.

**یەكەم:** هەندێك دەڵێن ئایا لەخودا پارانەوە لەدوای نوێژە واجبەكن بە دەست پان كردنەوەو دەست بەرزكردنەوە وەلەكۆتایشی دەست بە دەم وچاو داهێنان بیدعەیە؟

**وەڵام:** باشە ئەگەر تۆ دەستت لە بەر خودا پان نەكەیتەوەو بەرزنەكەیەوە ئەی بۆكێ پان و بەرزی دەكەیتەوە كێ تەنها خودا نەبێت شایستەی ئەوەیە كە دەستمان لەبەری پان بكەینەوەو داوای لێ بكەین نالێم واجبە بەلام (بیدعە)ش نییە بەلگەشم ئەم فەرموودانەی پێغەمبەرە (ﷺ).

**عن انس (رضي الله عنه) ان (ﷺ) (كان يرفع يدية حتى يرى بياض ابطية في الدعاء ولايشير باصبعه)** متفق عليه

**وعن الامام عمر (رض الله عنه) قال كان رسول الله (ﷺ) اذا امدَّ يدية في الدعاء هم يردّها حتى يمسح بهما وجهه.** رواه الترمذي والحاكم.

لەواتا ئەم دوو فەرموودەیە بۆمان روون دەبێتەوە كە پێغەمبەر (ﷺ) لەپارانەوە دەستی بەرزی بەرزكردۆتەوەو دەستیشی بەكۆتاییدا بەدەم و چاوی داهێناوە.

**دووەم :** هەندێك دەڵێن ئایا (ذكر) كردن بەدەنگی بەرز دوای نوێژەكان (بیدعە)یە؟

**وەڵامی** ئەم پرسیارە بەو فەرموودەیە دەدەینەوە كەكوری عەباس بۆمان دەگێرێتەوە.

**عن ابن عباس كنت اعرف انقضاء صلاة رسول (ﷺ) بالتكبير.** متفق عليه.

واتە بەبیستی (الله اكبر) دەمزانی پێغەمبەر (ﷺ) كۆتای بەنوێژەكان هێناوە.

هەروەها سەبارەت بەزیكركردن و پاداشتی ئەو كەسانەی كە زیكردەكەن ئینجا چ (سبحان الله، الله اكبر، ...هتد) بێت ئەم فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) بێت باس دەكەین.

**عن ابی ذر رضي الله عنه ان رسول الله (ﷺ) قال: (يصبح على كل سلامي من احدكم صدقة فكل تسبيحة صدقة وكل تحميدة صدقة وكل تهليلة صدقة وكل تكبيرة صدقة وامر بالمعروف صدقة ونهي عن المنكر صدقة ويجزي من ذلك ركعتان يركعها من الضحى).**

**سێیەم:** هەندێك دەڵێن ئایا نوێژی پێش خوتبەی ڕۆژی هەینی كەبە ناوی سونەتەوە دەكرێ (بیدعە)یە؟

**لە وەلام** دا دەڵێم سونەتە و بەڵگەشم ئەم فەرموودەی پێغەمبەرە (ﷺ) كە دەفەرموێت: **(بين كل اذان صلاة).**

واتە لەنێوان هەردوو بانگێكدا نوێژێكی سونەت هەیە وەسونەتی ڕۆژی هەینی لەنێوان بانگی یەكەم و دووەم دا دەكرێت.

لەپاشان سونەتی جمعە بەشێوەیەكی یەك لەدوای یەك بۆ ئێمە هاتووە وە ماوەی نێوان هەینی بۆ هەینی ئەوەندە زۆر نی یە كە گۆڕان كاری وای تێدابكرێت و نوێژێكی تیادا زیاد بكرێت بەبێ ئەوەی لە سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) كرابێت.

وە زۆر نموونەی تریشی هەیە كە پرسیاری زۆر بێ سوودن وەهیچ دەورێكیان نی یە بۆ پێش خستنی ئایین جگە لەوەی كە دەبنە هۆی دروست كردنی چەند خاڵێكی جیاوازی لەئایین دا هەروەكو چۆن دەپرسن دەڵێن هەستانەوە بۆ مێوان بیدعەیە وەئەو كردەوانەی كە پرسیاری دەربارەی دەكەن خۆی لەخۆی دا هیچ زەرەرێكی نی یە لەسەر ئایین و كۆمەڵی موسڵمانان لەبەر ئەوەی ئەگەر من بۆ موسڵمانێك هەڵبستمەوە وە كەدێتە لای من چی یە تەنها ئەوە نەبێت كەڕێز لێنانێكە لەلایەن من

بۆ ئەو میوانە یان ووتنی ووشەی (صدق الله العظیم) تەنها ئەوە دەگەیەنێت کە مـن بڕوام هێنا بەڕاست گۆیی خوداو بەقورئان ئینجـا چ ڕێگرێك هەیـە کـە ئـەم بـاوەڕە بەزمان ئاشکرا بکەم.

وەزۆر پرسیار و وەڵامی تریش بەڵام گشتی وەکو باسم کـرد پرسیاری بـێ سـوودن ئەگەرە بۆ ئایینمان دروست دەکەن و دوودڵی و دووبەرەکی بۆ موسڵمانان دروسـت دەکەن وە بەشتی بێ سـوود خـەریکیان دەکـەن وە دەبنـە هـۆی ئـەوی دوژمنـانی ئیسـلام دەرفـەت وەربگـرن بـۆ ئـەوەی (طعنـة) لـە ئاییـنمـان بـدەن وە کۆمـەڵی موسڵمانان خەریك بکەن بەوەی کە چۆن ڕەت دانەوەی ئەو (طعنانة) دەدەنەوە وە هەموو تواناى خۆیان بۆ ئەم کردارە دادەنێن وە لە ئەنجام دا دەبێتـە هـۆی بـەرەو پاش چوونی ئەم کۆمەڵە لە بەگەیشتنی بەجیهانی تازە.

## ٢-ریابازی ( الریاء ) ڕووپامایی :

بریتی‌یە لە ئەنجام دانی کردەوەیەك یان هەرشتێك کە پەیوەندی بەئایینەوە هەبێت وە مەبەست لـە کردنـی دا ڕەزامـەندی خـودای گـەورە نـەبێت بـەڵکو تەنـها بـۆ کـۆ کردنەوەی چەند پروپیتی ئەم جیهانەو ناوبانگی بێت.

ریابازی بـەخراپترین کـردەوە دادەنرێت لەبـەر ئـەوەی دوو لایـەنی خراپـی هەیـە یەکەمیان پەیوەندی بەوکەسەوە هەیە کە پێی هەڵدەستی کە بەم کارەی پاداشتی ئەم کردەوە چاکەی خۆی لەدەسـت دەدات وە دووەمیـان پـەیوەندی بـە کۆمەڵـەو هەیـە کـە بـەکردەوە چاکـەکانی ئـەم کەسـانە هەڵدەخەڵـەتێندرێن و بەشـێوەیەکی تایبەتی هەڵسوو کەوتیان لەگەڵ دا دەکەن.

هەر لەبەر ئەوە خودای گەورە ئاگاداری ئەو کەسانە دەکاتەوە کە چاکە دەکەن کە پاداشتی ئەم چاکەیان لەدەست نەدەن وەکو ئەو کەسانەی کە ریابازی دەکەن کە

دەفـەرموێت : ﴿لا تبطلوا صدقاتکم بالمن والاذی کالذی ینفق ماله رئاء الناس﴾ البقرة:١٤٥.

لـەمانای ئـەم ئایەتـەدا بۆمـان روون دەبێتـەوە کـە ئـەو کەسـانەی مـاڵی خۆیـان دەبەخشن و پێش کەشی کۆمەڵ دەکەن بـە نیـازی نـاو دەرکـردن و بـاس کردنیـان لەناو خەڵك دا بەم کردارە پاداشتی ئەم کردەوە چاکانە لەدەست دەدەن.

بۆیە دەبێت موسڵمان هەردەم ئاگاداری کردەوەکانی خۆی بێـت وەهـەردەم نیـازی چاکە بێت لەگەڵ بەرامبەرەکەی وە پڕ بەدڵ بۆ خودا بیانکات نەك بۆ ناو دەرکـردن و دەست کەوتنی هەندێك پرووپیتی جیهان.

پێغەمبـەرمان (ﷺ) بێـت لـە فـەرموودەکانی دا دەربـارەی ریابـازی ئاگادارمـان دەکاتـەوە و ئامۆژگـاری ئـەوەمان لێ دەکـات کـە هـەردەم لـەم کـردارە بـەدوور بکەوینەوە و خۆمان بپارێزین.

**عن جندب (رضي الله عنه) عن النبي (ﷺ) قال: من سمع سمع الله به ومـن یرائـي یرائي الله به)** رواه الشیخان البخاري ومسلم

دەفەرموێت هەرکەسێك بۆ ناوبانگ و نـاو دەرکـردن چاکـە و خـودا پەرسـتی بکـات لەرۆژی قیامەتدا خودا بەپەندی دەکات وەهەر کەسێك بۆ ڕواڵـەت هـەرکارێك بکـات لـەرۆژی دوایـیدا خـودا پـەردەی لـە ڕووی هـەڵ دەگـیرێت و ریابازییەکـەی ئاشـکرا دەکات.

بۆیە پێویستە موسڵمان کاتێك بەخودا پەرستی هەڵدەستێت چ لەنوێژکردن و حـەج کردن دایان هەر کەردەوەیەکی تری ئایینیدا پێویستە پڕبەدڵ بۆ خودا بیکات نـەك لەبەر چاوی هەندێك خەڵك بیکات تاوەکو پـێی بڵێن بەڕاستی باوەر دارە.

لەبەر ئەوەی هەر کاتێك وا بکات ئەوا زەرەرە لەخۆی دەدات لەدوولایەن یەکەمیان پاداشتی ئەو چاکانەی لێ وەرناگرێت لەبەر ئەوەی بۆ خودای گەورە نەی کردووە دووەمیان بەهۆی ئەو کردارە بەرەو دۆزەخ دەروات.

هەروەکو لەم فەرموودەیە بۆمان روون دەبێتەوە :

**عن ابي هريرة (رضي الله عنه) عن النبي (ﷺ) قال: (تعوذوا بالله من جب الحزن. قالوا: يارسول الله وما جب الحزن؟ قال: واد في جهنم تتعوذ منه جهنم كل يوم مائة مرة قلنا: يارسول الله ومن يدخله؟ قال: الفقراء والمراؤون باعمالهم).** رواه الترمذي

واتە پەنا بگرن بە خودا لە دەرەی خەم گوتیان ئەی پێغەمبەری خودا دەرەی خەم چیە؟ فەرمووی شوێنێکە لە دۆزەخ کە هەموو رۆژێك دۆزەخ خۆی سەد جار پەنا دەگرێت بەخودا لەدەستی گووتمان ئەی پێغەمبەری خودا ئەوە کێ دەچێتە ئەوێ؟ فەرمووی ئەو قورئان خوێنانەی دەچیتێ کەبۆ رواڵەت قورئان دەخوێنن.

**عن ابي هريرة (رضي الله عنه) عن النبي (ﷺ) قال: من تعلم علما ينبغي بـه وجـه الله لا يتعلمه الا يصيب به عرضا من الدنيا لم يجد عرف الجنة يوم القيامة.** رواه ابو داود وابن ماجة

واتە هەرکەسێك زانستێك فێربێت لەوشتانەی کە بەزانستی ئایینی دادەنرێت دەبێ مەبەستی لە فێربوونیدا رەزامەندی خودابێت. بەڵام ئەو بۆ ئەوە بێت کە پروپیتی ئەم جیهانەی پێ کۆبکاتەوە ئەوا ئەو کەسە لەرۆژی قیامەتدا بۆنی بەهەشت ناکەن.

**عن ابن عمر (رضي الله عنهما) عن النبي (ﷺ) قال: من تعلم علما لغير الله او اراد به غير الله فليتبوا مقعدهُ من النار.** رواه ابو ماجة والترمذي.

واتە هەرکەسێك زانستێك فێربێت و مەبەستی پێی رەزامەندی خودا نەبێت بەڵکو بۆ رەزامەندی چەند کەسانێکی تربێت باخۆی ئامادە بکات بۆ شوێنی لە دۆزەخ دا.

## کۆمەڵگای نموونەیی

بەراستی ئیمڕۆ زۆر لەو کەسانە دەبینین کە کردەوە ئایینی‌یەکان بەکاردەهێنن بۆ لەخشتە بردنی خەڵکانی‌تر.

بەڵێ زۆر کەس قورئان دەخوێنێت لەناو کۆمەڵی موسڵمانان بۆ ئەوەی پێی بڵێن قورئان خوێنە یاخود بۆ ئەوەی چەند پرۆپیتی بەدەست بکەوێت کە ئەمانەش لەگەڵ مەبەستی قورئان خوێن جیاوازە وە ناگونجێ. وەچەند کەسانێکی دیکە داوای زانست دەکەن و بەدوای فێربوونی دەگەڕێت تەنها مەبەستیان پێی ئەوەیە کە پێیان بڵێن زانا یان بۆ ناودەرکردنیان لەمێژووی جیهاندا یاخود بۆچەند مەبەستێکی تر. وەزۆر کەس هەیە نوێژ دەکات لەبەر دەم کۆمەڵی موسڵمانان بۆ ئەوەی پێی بڵێن نوێژ دەکات کە چی کەلەو کۆمەڵە دادەبڕێت و دەڕوات نوێژ ناکات.

وە خراپترین ئەنجامی ریابازی ئەوەیە کە ئەو کەسانەی بەو کارە هەڵدەستن.وە کردەوەی چاك دەکەن تاوەکو خەڵك باسیان بکات وە مەبەستیان پێی رەزامەندی خودای گەورە نی‌یە ئەم باس کردنەی خەڵکی وا لە هەندێك کەس دەکات کە رێزیان لێ بگیرێت وە ئەم رێزگرتنە دەبێتە هۆی لەخۆ دەرچوونی ئەو جۆرە کەسانە وە لە ئەنجام دا ئاگاداری خۆیان نابن و تەنها بیر لەوە دەکەنەوە کە چۆن وچی بکەن بۆ ئەوەی خەڵك زیاتر باسیان بکات و بەباشی ناویان ببات وە بەرە بەرە لە خۆبایی بوون دەڕوون تاوەکو دەچنە خراپترین شوێن لە ئاگری دۆزەخ کەپێی دەڵێن دەرەی خەم کە دۆزەخ خۆی رۆژێ سەد جار پەنا دەباتە خودا لەم ئاگرە.

ئینجا خوێنەری بەڕێز پێویستە هەردەم لە ریابازی دوور بکەوێتەوە. چونکە بەراستی کارێکی خراپ و بێ سوودە لەبەر ئەوەی تۆ کاتێك بە کارێکی چاك هەڵدەستی بۆ چی ئەو کارە.لە پێناوی خودای گەورە و رەزامەندی خودا نەبێت کە لە هەمان کات دا پاداشت لە خودای گەورە وەرەگریەوەو خەڵکیش لەوانەیە بە

چاکی باسـت بکات بـۆ چـی بـەنیازی نـاوداری رەزامـەندی هـەندێك چینـی کۆمـەڵ ئەنجامی دەدەیت کە تەنـها بـەرەو دۆزەخـت دەبـات یـان تـۆ هـەرداوای فـێربوونی زانست دەکەی بۆ خودا نەبێت لەبـەر چـی بـۆ لەبـەر ئـەوە بێـت کـە دەمـەوەری لێ بکەی لەگەڵ نەفامانان و نەزانان یان بۆ ئەوەی خەڵك رووی دەمیانت لێ بکەن.

لەبەر ئەوە پێویستە کردەوەکانمان هەردەم پڕ بەدڵ بۆ خوداو رەزامەندی ئەو بێت و هەردەم خودای گەورەمان لە بیر بێت لە گشت کارو کردەوەیەکدا خـودای گـەورە دەفەرمووێت:

﴿وإذا قاموا الى الصلاة قاموا كُسالى يُراؤن الناس ولا يذكرون اللهَ إلاّ قليلاً﴾ النساء:١٤٢

لێرەدا خودای گـەورە باسـی رەوشـتێکی ناپـاك و دوو رووەکانمـان بـۆ دەکـات کـە دەفەرمووێت ئەمانە تەنها بۆ ئەوە نوێژ دەکەن تاوەکو خەڵك پێیـان بڵێـن نوێژکـەر بـۆ ئـەوەی بـە خـراپ و بـێ نـرخ سـەیریان نەکـەن وە بۆیـە ریابـازی لـە رەوشـتی موسڵمانان نی‌یە و پێویستە خۆمانی لێ دوور بگرین وە تەنها لەو دوو رووە ناپاکانە دەوەشێتەوە.

**عن ابي هريرة (رضي الله عنه) عن النبي (ﷺ) قال: (إن اول النـاس يُقضـى عليـه يوم القيامة رجلٌ استشهد فاتي به فعَرَّفه نعمته فعرفها قال فما عملـت فيـها؟ قـال: قاتلت فيك حتى أستشهدتُ قال: كذبت ولكنك قاتلت لأن يُقال جريٌ فقد قيل ثـم أُمر به فسحب على وجهه حتى أُلقي في النار.**

**ورجلٌ تعلَّم العلم وعلَّمه وقرأ القرآن فاتي ربه فعَرَّفه نعمته فعرفها قال: فمـا عملـت فيها؟ قال: تعلَّمت علم وعلَّمته وقرأت فيك القرآن قال: كذبت ولكنـك تعلَّـت العلـم ليُقال عالم وقرأت القرآن ليُقال هو قاريء فقد قيل ثم أُمر به فسـحب علـى وجهـه حتى أُلقي في النار.**

**ورجلٌ وسَّع الله عليه واعطاه من اصناف المال كله فاتى ربــه فعَرَّفـه نعمته فعرفـها قال: ما عملت فيها؟ قال: ما تركت من سبيل تحب ان ينفق فيها إلاّ انفقت فيها لك، قال: كذبت ولكنك فعلت ليقال هو جواد فقد قيل ثم أُمر به فسحب على وجهــه ثـم أُلقي في النار.** رواه مسلم والترمذي والنسائي.

ئەم فەرموودەیە باسی دادگایی کردنی خەڵك دەکـات لـە رۆژی دوایـیدا کـە یەکـەم کەس لە رۆژی دوایی‌دا دادگایی دەکرێت ئادەمیزادێکە کە شەهید کـراوەو دەیـهێنن لە بەردەم خـودای گـەورە دەیوەسـتێنن وە خـودای گـەورە چاکـەکانی خـۆی یـەك بەیەك بیر دەکاتەوە ئەویش یـەك بەیـەك پـێـیان لێ دەنێـت ئینجـا خـودای گـەورەو میهرەبان دەفەرموێت باشە لە جیاتی ئەو چاکانە تۆ چ کارێکی باشت کـردووە بـۆ من؟

ئەویش لـە وەڵام دا دەڵێـت: منیـش لـە پێنـاوی تـودا جـەنگم کـردووە وە لـە گـەڵ دوژمنانی تۆدا شەرم کردووە تاوەکو لە ئەنجام دا بەدەسـتی دوژمـن شـەهید کـرام خودای گـەورە وەڵامـی دەداتـەوەو دەفـەرموێت: درۆت کـرد تـۆ بۆیـە جـەنگاوێت تاوەکو پێت بڵێن ئازایە و چاو نەترسە وە ئـەم قسەیەشـیان لـە دونیـا پـێ گوتیـت کەواتە تۆ بە مافی خۆت گەیشتیت ئینجا فـەرمان دەدات کـە لەسـەر روو رابکێشـن تاوەکو دەیخەنە ناو ئاگری دۆزەخەوە.

وە دووەم کەس کە دادگایی دەکرێت ئادەمیزادێکە کە لـە دونیـادا زانـاو مامۆسـتاو قورئان خوێن بووە.

خـودای گـەورە هـەروەکو کەسـی یەکـەم هـەر چـی چاکەیـەکی لەگـەڵ کـردووە دەیهێنێتەوە بیری ئەویش یـەك بەیـەك پـێـیان لێ دەنێـت، ئینجـا خـودای گـەورە و میهرەبان دەفەرموێت باشە تـۆ لـە جیـاتی ئەوانـە چ کردەوەیـەکی باشـت کـردووە لەبەر خاتری من؟

ئەویش لە وەڵام دا دەڵێت منیش زانست و زانیاری فێر بووم و خەڵکی ترم فێری زانین کردووەو قورئانم لە پێناوی تۆ خوێندۆتەوە. لە وەڵام دا خودای گەورە دەفەرموێت: درۆت کرد. تۆ بۆیە فێری زانست و زانیاری بویت تاوەکو پێت بڵێن زانا وە قورئانت بۆیە دەخوێند تاوەکو پێت بڵێن قورئان خوێنە وە ئەمەشت پێ گوترا.

ئینجا فەرمان دەدات کە لەسەر روو وەکو کەسی یەکەم رایبکێشن تاوەکو دەیخەنە ناو ئاگری دۆزەخ.

ئینجا باسی کەسی سێیەم دەکات کە دادگایی دەکرێت ئەویش ئادەمیزادێکە کە خودای گەورە لە دونیادا داراو دەوڵەمەندی کردووە وە هەروەکو کەسی یەکەم و دووەم خودای گەورە لێی دەپرسێ کە چیت لەوانە کرد؟ ئەویش دەڵێت هەرچی تۆ پێت خۆش بێت کە ماڵی بۆ بەخش بکرێت لەوەدا ماڵم خەرج کردووە.

خودای گەورە دەفەرموێت درۆ دەکەی تۆ بۆیە وات دەکرد تاوەکو بڵێن سەخییەو ئەو قسەیەش لە دونیا دا کراوە.

ئینجا فەرمان دەدات کە لەسەر روو رایبکێشن تاوەکو دەیخەنە ئاگری دۆزەخ.

لەم فەرموودەیە چۆنیەتی دادگای وئەنجامی ئەو کەسانەمان بۆ روون دەبێتەوە کە هەردەم هەوڵی ریابازی دەدەن و هاوبەش لە کارەکانیان بۆ خودای گەورە پەیدا دەکەن واتە کردەوەکانیان بۆ رەزامەندی و لە پێناوی خودا نایکەن وەئەمەش پێچەوانەی داوای خودایە کە دەفەرموێت: ﴿وما امروا الا ليعبدوا اللّٰه مخلصين له الدين حنفاء﴾ البينه: ٥

بۆیە موسڵمانان دەبێت هەریەکە لەئێمە کاتێك بەهەرکردەوەیەك هەڵدەستین لەپێناوی خودای گەورە دەبێ پڕ بەدڵ بۆخودای گەورە بێت واتە بەنیازێکی ساف

بۆ خودا بیکەن نەك لەبەر پێناوی چەند کەسانێك بیان کەین یان بۆ ئەوەی لەناو خەڵك بناسرێت وەبە سەخیو بەزاناو قورئان خوێن ناومان ببەن و خەڵك باسی ئەو کردەوانە بکات وەئەم کارەش دەبێتە هۆی سڕینەوەی پاداشتی ئەم چاکەیەوە.

جگە لەمەش دەبێتە هۆی دروست کردنی چەندین هۆکاری دەروونی لەسەر خووڕەوشتی ئادەمیزاد ئینجا چ دەربارەی پەیوەندی ئەم ئادەمیزادە لەگەڵ خۆیدا بێت یاخود لەگەڵ کۆمەڵدا.

بۆنموونە کاتێك ئەو جۆرە کەسانە هەڵدەستن بە ئەنجام دانی چەند نوێژێك لەبەرخاتری چەند کەسانێك واتە بۆ ڕەزامەندی خودای گەورە ئەنجامی نادات ئەم کارە کار لەدەروونی ئەم جۆرە کەسانە دەکات.

لەبەر ئەوەی ئەم کارەوایان لێ دەکات کەبەبەردەوامی لەدڵە ڕاوکێ دابن ئاخۆ ئەو کەسانەی بەرامبەریان بەم کارایان دەزانێت یان ناوە هەست بە کەم و کوڕی دەکات کاتێك بەم کردارە هەڵدەستێ وەبەبەردەوام بوونی ئەم هۆکارە دەبێتە هۆی کاردانەوەوکار کردنی لەسەر دەروونی ئادەمیزاد و تووشی چەندین نەخۆشی دەروونی دەکات وەئەم نەخۆشییە دەروونیانەش وەکو باسمان کرد دەبنە هۆی تووش بوونی ئادەمیزاد بەچەندین نەخۆشی تر کەپیوەندی بەئەندامەکانی تری لەشی ئادەمزادەوە هەیە لەبەر ئەوەی ئەو نەخۆشیانەی ئادەمیزاد تووشی دەبێت هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ نەخۆشییە دەروونییەکان.

## ٣- منەت و ئازاردان لەخێرکردندا (المن والاذى بالصدقة):

## کۆمەڵگای نموونەیی

پەیامی موسڵمانیەتی ڕۆڵەی خۆی پەروەردە دەکات لەسەر ئەوەی کەماڵ و سامان گشتی هی خودایەو ئەو تەنها جێگرێکە بۆ ئەو سامان و داراییە کەلەلایەن خودای گەورەوە دامەزراوەو لەسەری‌دا وە ئەم جێگیرتنەش لەچەند پلەیەکدایە بەجۆرێك کەسەیر دەکەی هەندێك کەس بەشێکی کەمیان لەژێر دەست دایە لەهەمان کات دا هەندێکی‌تر دەبینین لەو بەندانەی خودا کەسامان و دارایی‌یەکی فراوانیان لەژێر دەست دایە بۆیە یەك لەیاساکانی خودای گەورە داواکردنە لەو کەسانەی کەسامان و داراییان فراوانە کەماڵ و سامان ببەخشن بەو کەسانەی کەنەبوونن، بەمەبەستی دروست کردنی برایەتی و بەهێز کردنی پەیوەندی کۆمەڵایەتی لەنێوان هەژارو دەوڵەمەندەدا بەشێوەیەك کەلەیەکتر نزیك ببنەوەو کەسیان ڕقی لەوی تر نەبێتەوەو ڕێزی لەیەکتر بنێین لەلایەکی تردا دەبێتە هۆی پاراستن و ڕزگار کردنی خاوەنەکەی لەچاوچنۆکی و ڕەزیلی وەدەبێتە دڵ خۆش کەرێك بۆ هەژارو داماوان کەسێبووریان بەم بەخشینە دێتەوەو دەبێتە هاندەرێك بۆیان بۆ ئەوەی بەیانی هەوڵ بدەن کەکارێك بدۆزنەوەو ژیانی خۆیان پێ چارەسەربکەن.

لەبەخشینی ماڵ و دارایی‌دا پێویستە ڕەچاوی چەند خاڵێکی گرنگ بکرێت لەکاتی بەخشینی ئەو ماڵ و سامانە بەهەژارو داماوەکاندا ئەگینا پاداشتی لەبڕی ئەو چاکەبەدەست ناکەوێت و بەسەری دادەڕێتەوە.

**یەکەم:** خاڵ کە پێویستە ڕەچاوبکرێت ئەوەیە کە بەخشینەکەی لەبەر ڕەزامەندی خوداو فەرمانی خودا بێت نەك لەبەر خاتری چەند کەسانێك بێت.

**دووەم:** هیچ منەت و کەشخەیەك لەسەر هەژارەکەنەکات.

**سێیەم:** پێویستە هیچ داوایەکی لێ نەکات بەرامبەر بەو بەخشینە.

وەخاڵی دوەم و سێیەم دەبنە هۆی ئازاردانی ئەو کەسەی کە ئەو ماڵە وەردەگرێت و کار لەدڵ و دەروونی دەکات بەجۆرێك هەست بەکەم و کورِی دەکات بەرامبەر بەو کەوسەی کەدەستی لەبەر پان دەکاتەوە ئەگەر رەچاو نەکرێن.

بۆیە خودای گەورە ئەو کەسانە ئاگادار دەکاتەوە کەمنەت وئازاری هەژران دەدەن لەکاتی بەخشینی دارایی بەسەریان دا کەئەوان بەم کارەیان پاداشتی ئەو کردەوە چاکەیان دەسرِنەوەو لەناو دەبەن واتە ئەم کارەکار لەو کردەوەچاکەیان دەکات کەدەفەرمووێت:

﴿يأيها الذين امنوا لاتبطلوا صدقاتكم بالمن والاذى كالذى ينفق ماله رئاء الناس ولايؤمن بالله واليوم الاخر فمثله كمثل صفوان عليه تراب فأصابه وابل فتركه صلداً لا يقدرون على شيء مما كسبوا والله لايهدى القوم الكافرين﴾

البقرة: ٢٦٤

واتە ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان هێناوە خێرو چاکە کانتان بێ پاداشت مەکەن بەمنەت و ئازاردانی دڵی هەژاران وەکو ئەو کەسەی کەماڵ دەبەخشێ بۆ ئەوەی لەناو خەڵك دا ببینرێ وە ئەمەش لەبەر ئەوەی ئەو کەسەباوەڕی بەخوداو رِۆژی دوایی نی‌یە تاوەکو بەخشینەکەی بۆ خودا بێت و بەهیوای رزگار بوون بیدات لەرِۆژی دوایی دا وەئەو کەسە وەکو بەردێکی رەق و ساف وایە کەخۆڵێکی کەمی بەسەرییەوە بێت ئینجا بارانێکی دڵۆپە گەورەی بەسەردا ببارێت و خۆڵەکە بەتەواوی بشواتەوە تابەردەکە ساف دەبێت لەتۆزو خۆڵ وە ئەو کەسە بەم کردەوەیەی خێرو ماڵ بەخت کردنەکەی رەش دەکاتەوەو پاداشتی بەرامبەر وەرناگرێت بەجۆرێك کەهیچ شتێکیان بۆ نانوسرێت لەو چاکانەی کە کردوویانە وەهیچ پاداشتێکی لەبری‌دا وەرناگرێت.

خوێنەری بەڕێز خودای گەورە پێویستی بەبەخشینی ئێمەنی یە بەڵکو بۆ بەرژەوەندی ئێمە فەرمانی بەبەخشینی ماڵ و سامان و خێرو چاکە کردن کردووە ئەگینا ئەو دەوڵەمەندەو پێویستی بەچاکەکانی بەندەکانی نی یە.

وەکاتێك تۆ شتێك دەبەخشی بەهەژارێك پێویستە منەت بزانی لەو هەژارە کەمنەت لەسەر بکات کاتێك ئەو پارەیەت یان ئەو شتەت لێ وەردەگرێت چونکە تۆ لەرێگای ئەو هەژارە دەست کەوتێکی گەورەت دەبێت لەپاداشت لەلایەن خودای گەورە کەبەراورد بکرێت لەگەڵ ئەو شتە کەمەی کەتۆ دەدەی ئەو هەژارەو خودای گەورە ئەو پاداشتە فراوانەت دەداتەوە.

وەقسەیەکی خۆش لەگەڵ هەژارو داماواندا لەخێری چاکەیەك باشترەکە ئازار و دڵ گران دەبن پێی کەدەفەرموێت.

﴿قول معرف ومغفرة خير من صدقة يتبعها اذى والله غنى حكيم﴾ بقرة: ٢٦٣

لەکۆتایی ئەم ئایاتە خودای گەورە دەفەرموێت کەئەو لەسەر خۆو پەلە ناکات بەتۆڵە سەندن ئەگینا بەزووترین کات تۆڵەی ئەسەن لەوانەی کەمنەت ئەنێن ودڵی هەژاران دەرەنجێنن.

وەهەروەها دەفەرموێت: ﴿ولا تمنن تستكثر﴾ المدثر: ٦

واتە هیچ شتێك مەبەخشە ئەگەر بەنیازی ئەوەی کەداوای شتی زۆر بکەی بەرامبەر بەو بەخشینەدا.

بەمانای ئەوەی تۆ بەم کردارە ئازاری ئەو کەسە دەدەیت و نیازی خراپت هەیە لەو بەخشینەدا بۆیە لێت وەرناگیرێت و بەسەرت دائەدرێتەوە وە دەبێتە مایەی دڵ ڕەق بوونی هەژاران لەلایەك و هەست بەکەم و کوڕی خۆت لەلایەکی تر کە هەست دەکەی هیچ تاقم وچێژێکت لەم بەخشینەدا نەکردووە وەئەمەش شتێکی

سروشتی‌یە لەبەرئەوەی پاداشت وەرناگری لەلایەن خودا دا بۆیە بەکردارێکی خودایی هیچ هەست بەدڵ خۆشی ناکەی لەو کارە دا کە بەو نیازە دەیکەیت و منەت لەسەر هەژاران دەکەی.

بۆیە پێویستە کاتێك ماڵ دەبەخشین ئەو بەخشینەمان لەسەر رێگایەکی موسڵمانیەتی بێت و مەبەستمان پێی پارمەتی دانی هەژاران بێت بۆ نەهێشتنی برسێتی و رەش و رووتی لەناو کۆمەڵی مەسڵمانان دا بەمەش هەردەم هەست بەئارامی دڵ و دەروون دەکەیت وهەست دەکەی تۆ شوێنێکت گرتووە بۆ چاك کردنی کۆمەڵ و خۆت بەبەختەوەر دەزانی لەو کاتەی کەماڵ و سامان دەبەخشی وەبەبەخشینی ماڵ و سامان دارایی خاوەنەکەی بەهیچ جۆرێك کەم ناکات ئەگەر بێت وبەنیازێکی ساف بۆ خودا بیدات بەڵکو هەردەم لەزیاد بوون دادەبێت کە دەفەرمووێت:

﴿يمحق الله الربا ويربي الصدقات والله لايحب كل كفار اثيم﴾ البقرة: ٢٧٦

## ئازار دانی دایك و باوك ( عقوق الوالدين )

واتە دڵ تەنگ کردنی دایك وباووك بەهەر شتێکی خراپ ئینجا چ ئەم شتە لەرێگای دەرچوون بێت لەو شتانەی کە داوامان لێ دەکەین کەئەنجامی بدەین یاخود لەرێگەی ئەو کردارانە بێت کەداوامان لێ دەکەن کەپێی هەڵنەستین و ئەنجام نەدەین بەمەرجێك ئەم داواکاریانە نەبێە هۆی دەرچوونمان لەرێگای ڕاست.

سۆزو بەزەیی دایك و باووك بەنرخترینو بەرزترین مانای ژیان دەگەێنێت بەتایبەتی سۆزی دایك کەلەپێناو کورپەکەی دا هەموو ژیانە تەرخان دەکات بۆ پێ گەیاندنی ئەم کورپەیە بگرە هەر لەیەکەم رۆژی دروست بوونی لەنێو سکی دا تاوەکو لەدایك بوونی وبەبەردەوامی ئەم دایکە کورپەکەی لەبیر ناکات هەرچەندە ئەم منداڵە

گەورەتر دەبێت و لەوانەیە ماڵیشی دابنێ بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا سۆزی دایک باوەڕناکات و هەردەم چاوی لەڕۆڵەکەی دایە.

ئەم سۆزو بەزەییە والە ئادەمیزاد دەکات ئەگەر بێت وبەپێچەوانەی کاریکات تووشی نەهامەتی و سەر لێشواندن بێت لەبەر ئەوەی تووڕەیی دایک و باووك لەگوناهە گەورەکان دەژمێردرێت بۆیە پێغەمبەرمان (ﷺ) لەفەرموودەکانی دا ئاگادارمان دەکاتەوە لەو خراپی‌یە گەورەیە کەدەفەرمووێت: **(الا انبئك بأكبر كبائر ثلاثا، قلنا بلى يارسول الله قال: الاشراك بالله، وعقوق الوالدين وكان متكئاً فجلس فقال الا وقول الزور ، وشهادة الزور، فما زال يكرها حتى قلنا ليته سكت)** متفق عليه

لەم فەرموودەیەدا پێغەمبەر (ﷺ) تورەکردنی دایک وباووك بەپلەی دووەم دەهێنێتەوە لەپاش هاوبەش دانان بۆ خودای گەورەو میهرەبان دیارە ئەمەش لەبەر گەورەیی ئەم گوناهەیە کەبەم جۆرە لەپاش هاوبەش دانان بۆ خودای گەورە باسی لێ کردووە وئاگادارمانی کردۆتەوە لەئنجامەکانی دا کە تووڕەکردنی دایك و باووك لەگەڵ ئەوەی کارێکی دوون لایەن دەکاتە سەر دڵ و دەروونمان لەهەمان کاتکیش دەبێتە هۆی وەرنەگرتنی چاکەکانمان وەبەسەرمان دادەدرێتەوە ئەگەر خۆمان لەو گوناهە گەورەیە نەپارێزین کە دەفەرموێت: **(ثلاثة لاينفع معهن عمل: الشرك بالله وعقوق الوالدين و الفرار يوم الزحف)** رواه الطبراني.

واتە ئەم سێ گوناهە هیچ کردەوەیەکی چاك نابێتە هۆی رەش کردنەوەی لەتەرازووی کردەوەکان دا کە بریتین لە هاوبەش دانان بۆ خودای گەورەو تووڕەکردنی دایك و باووك و هەڵاتن لەشەڕی بەرگری‌دا.

موسڵمانینە لەم فەرموودەیەدا شتێکمان بۆ ڕوون دەبێتەوە ئەویش ئەگەر بێت و یەکێك لەم گوناهانە ئەنجام بدەین و تۆبەی لەسەر نەکەین ئەوا هەر چەند

کردەوەی چاك بکەین لەبریدا هیچیان لێ وەرناگیرێت و بەسەرمان دا دەرێتەوە بۆیە پێویستە موسڵمان ئەگەر هەست بکات کەدایك و باووکی دڵیان شکاوە بەقەدەر نوکەدەرزی‌یەکیش پێویستە هەوڵ بدات بەزووترین کات دڵیان رازی بکات بەهەر جۆرێك بێ تەنانەت بەدووقسەی‌خۆشیش بێت، لەبەر ئەوەی ئەگەر بێت و دڵی دایك و باووك لیمان رازی نەبێت لەژیانمان دا تووشی چەندین تەگەرەیەك دەبین و شتی چاکمان بۆ نابێت و وەئەگەر بێت و داواشمان لێ بکەن پێویستە بەقسەیەکی خۆش دڵیان رازی بکەین.

لەبەرئەوەی رازی کردنی دڵی دایك و باووك ئەرکێکی پیرۆزە لەسەر شانی گشت ئادەمیزادێك بۆیە خودای گەورە لە قورئانی پیرۆز دەفەرموێت: ﴿ان اشكرلي ولوالديك الي المصير﴾ لقمان: ١٤

لەم ئایەتەدا خودای گەورە سوپاس وستایشی خۆی بەستۆتەوە بەسوپاسو ستایشی دایك و باووك واتە هەر کەسێك سوپاسی خودای گەورەی کردوو سوپاسی دایك و باووکی نەکرد ئەوا ئەم کارەی لێ وەرناگیرێت و بەسەری دادەرێتەوە.

وە دەفەرموێت:

﴿وقضى ربك الاتعبدوا الااياه وبالوالدين احساناً اما يبلغن عندك الكبراحدهما او كلاهما فلا تقل لهما اف ولاتنهرهما وقل لهما قولاً كريماً﴾ الاسرء: ٢٣

﴿واخفض لهما جناح الذل من الرحمة وقل رب ارحمهما كما ربياني صغيراً﴾

الاسراء: ٢٥

لێرەدا خودای گەورە داوامان لێ دەکات کەتەنها ئەو بپەرستین و لەهەمان کات دا لەگەڵ دایك و باووکمان دا رەوشت و کاری چاك ئەنجام بدەیین وە ئەگەر بێت و یەکێکیان یان هەردووکیان گەورەبوون واپیشان مەدەکەتۆ لێیان بێزاری هەروەها

دەمەدەمیان لەگەڵ دا مەکە لەو شـتانەی کـەپێت خـۆش نیـیە بەڵکوتەنـها قسـەی خۆشیان پێ بڵێ.

هەروەها باڵی خۆت کەچ بکە بۆیان و داوابکـە لـە خـودای گـەورە کەبـەزەییان پـێ بێتەوە هەروەکو چۆن ئەوان تۆیان پێ گەیاندوە ولەبری دا پێویستە هـەموو سۆزو نیانیکیان پێشکەش بکەیت وەبۆ ئەومەبەستەچەند خاڵێکی بۆمان دیـاری کردووە کەپێویستە لەسەرمان پەیرەوەی بکەین لەکارو کردەوەکانما لەگەلیان دا بەتایبەتی کاتێك لەتەمەن گەورە دەبن لەبەر ئەوەی ئـادەمیزادی بەتەمـەن بـەبچوکترین شت دڵـی دەرەنجـێ بـەجۆرێك زۆر دڵـی ناسـك دەبێـت تەنانـەت بەووشـەیەکی گـران لەبەرامبەرەکەی دڵ رەق دەبێت و هەسـت بـەبێ دەسەڵاتی و دڵ تـەنگی دەکات لەبـەر ئـەوە خـودای گـەورە داوامـان لێدەکـات کـە واپیشـان نـەدەین تـە نانـەت بەرووکاری دەم و چاومانیش کە بێ زارین لێ یان.

وە گـەورەیی پلـەی دایـك و بـاووك لـەم فەرموودەیـەدا بـەدیار دەکـەوێت کـەنزیك بوونەوە و خوورەوشتی چاك لەگەڵ دایك و باووك پێش خۆبـەخت کـردن دادەنرێت لەپێناو پەیامی خودای گەورە کە دەفەرموێت:

**(اقبل رجل الى النبي (ﷺ): فقال: ابايعك على الهجرة والجهاد وابتغى الاجـر مـن الله تعالى فقال : هل لك من والديك احد حي؟**

**قال: نعم ، بل كلاهما، قال (فيتغي الاجر من الله تعالى؟ قال: نعم قال فارجع الى والديك فاحسن صحبتها)** متفق عليه.

## باسی سێیەم: کەم کەرەوەکان:

بریتین لەچەند کردەوەیەك کەدبنە هۆی کەم کردنەوەی چاکەکانمان لەکاتی ئەنجام دانیان دا.

بەمانای ئەوەی ئەم كردەوانە نابنە هۆی لەناو چوونی گشت كردەوە چاكەكانمان (وەكو لەناو بەرەكان) بەڵكو هەندێك لەكردەوەچاكەكانمان كەم دەكەنەوە وەبەردەوامی لەسەر ئەم كردەوە خراپانە والە خاوەنەكەی دەكات كە تەرازووی لایەنی باشی كەم بكات و بەلایەنی خراپەكانی‌دا دابشكێت.

وە ئەم كردەوانەی كەدەیگرێتەوە پەیوەندی بەرێكخستنی تاك و كۆمەڵ هەیە لەچەند لایەنێكی دا وە لەچەند لایەنێكی تردا پەیوەندی بەئادەمیزاد خۆیەوە هەیە وەسێ شت دەگرێتەوە:

١- الحسد ٢- الغيبه (باس كردنی پاشمله) ٣- النميمه.

**یەكەم: الحسد (حەسوودی):**

پێغەمبەرمان (ﷺ) دەفەرموێت:**(اياكم والحسد، فان الحسد ياكل الحسنات كما تاكل النار الحطب).**

واتە خۆتان بپارێزن لە حەسوودی بردن بەخەڵكی چونكە حەسوودی چاكەكانتان دەخوات هەروەكو چۆن ئاگر دار دەخوات.

لەشوێنێكی‌تر دەفەرموێت حەسوودی دین ئەتاشێ و چاكەش دەخوات.

لەم فەرموودانەی پێغەمبەرمان (ﷺ) ئاگادارمان دەكاتەوە لەو كردەوەخراپەیە كەپێویستە خۆمانی لێ بپارێزین لەبەر ئەوەی وەكو كەم كەرەوەیەك چاكەكانمان كەم دەكاتەوە پرسیارێك دێتە پێشەوە ئەویش ئایا حەسوودی چی‌یە؟

حەسوودی ئەوەیە کەتۆ حەزیکەی‌و هیوا بخوازی کەکەسێك شتێکی خۆی لەدەست بدات بۆتۆبێت یان ئەو کەسە ئەو شتەی نەبوایە بەڵکو بۆ هی تۆ بوایە.

وەکاتێك کە بەو کردارە خراپە هەڵدەستیٚ تۆناڕەزایی دەردەبڕی بەرامبەر بەخودای گەورەو میهرەبان کەشتێکی داوەبەکەسێك لەبەندەکانی وە نەیداوە بەتۆ ئەمە هۆی یەکەمی حەرام کردنی حەسوودی‌یە وەهۆی دووەم ئەوەیە کەکاتێك تۆ حەسوودی دەبەی بەکەسێك.

ئەم کردارە کار لەو کەسە دەکات و دەبێتە هۆی تێکدانی و شێواندی ئەو شتەی کە تۆ حەسوودیت پیٚ بردووە بۆیە خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ئاگادری پێغەمبەرمان (ﷺ) دەکاتەوە لە چاوپیسی ئەو کافرانەی کەدەیانەوێت بەو چاو پیسیەیان کارەکەی تێك بدەن کەدەفەرمووێت:

﴿وإن يكاد الذين كفروا ليزلقونك بأبصارهم لما سمعوا الذكر ويقولون انه لمجنون﴾القلم: ٥١

واتە ئەوکەسانەی کەباوەڕیان نەهێناوە بە خودای گەورە بەچاوێکی توندو تیژسەیری تۆ دەکەن بەجۆرێك هەندەی نەماوە کەلەخۆت ببەن و بت خەنە خواریٚ لەشوێنی خۆت دا...هتد.

لەم ئایەتەدا چەکێکی ئەو جۆرە کەسانەمان بۆ بەدیار دەخات کە چاویان بەکاردەهێنن لەحەسوودی بردن دا.

هەروەها لەشوێنێکی تردا داوامان لێ دەکات کە پەنا ببەیتە بەر خودای گەورە لەبەر خراپی ئەو کەسانەی کەدەیانەوێت حەسوودی لێ بدەن کە دەفەرمووێت:

﴿ومن شر حاسد اذا حسد﴾

وەخۆ پاراستن لە حەسوودی بردن بەخەڵکی یەکێکە لەورەوشتانەی کە پێویستە موسڵمان رەچاوی بکاتو هەوڵ بدات خۆی بپارێزێت لەچاو پیسی.

**عن ابي هريرة (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (ﷺ) لاتحاسدوا ولاتناجشوا، ولاتباغضوا، ولا تدابروا ولايبع بعضكم على بيع بعض، وكونوا عباد الله اخواناً المسلم اخوا المسلم لايظلمه ولا يخذله ولا يكذبه ولا يحقره، التقوى هاهنا ويشير الى صدره ثلاث مرات، يحسب امرىء من الشر ان يحقر اخاه المسلم كل المسلم على المسلم حرام دمه وعرضه وماله).** رواه مسلم.

لەم فەرموودەیەدا چەند رەوشتێکی موسڵمانانەمان بۆ دیاری دەکات کە پێویستە هەموو موسڵمانێك رەچاویان بکات لەکارو کردەوەکانی دا بەمانەی خوارەوە.

١- حەسوودی بەیەکتر نەبەین:

٢- ئەگەر کەسێك شتێك ئەکڕێ تۆش نەچیت و بڵێی من پارەی زۆرتری پێ ئەدەم وە مەبەست کڕینی ئەوشتە نەبێت بەڵکو تەنها بۆ هەڵخەڵەتاندی کڕیار بێت.

٣- ئەو جۆرە کردەوانە مەکەن کەدەبنە هۆی هەڵساندنی رق و کینە وەکو دووزمانی گاڵتە بەیەك کردن و ...هتد.

٤- كڕین و فرۆشتن مەكەن لەسەر كڕین و فرۆشتنی كەسانی‌تر وەكو ئەوەی كەسێك شتێك بكڕێ وەتۆش بچیت لەسەری زیاد بكەی.

٥- ببینە برای یەكتر چونكە موسڵمان برای موسڵمانە وەنابێ ستەمی لێ بكات و سەر شۆڕی بكات هەروەها نابێت بەچاوی سووك سەیری بكات.

ئەوەی باسمان كرد چەند رەوشتێكی باوەڕدارانە كە پێویستە بەم رەوشتانە بناسرێن وەلە پێش هەموویان دا كە حەسوودی بەیەكتر نابەن چونكە حەسوودی خراپترین نەخۆشی‌یە كەتووشی ئادەمیزاد دەبێت وە ژیانی لێ تێك دەدات ئەمەش هۆیەكەی دەگەرێتەوە بۆ كارێكی دەروونی ناوەكی چونكە ئەو كەسەی كەحەسوودی بە بەرامبەرەكەی دەبات زەرەر لەخۆی دەدات و خۆی تووشی چەندین نەخۆشی دەكات لەبەرئەوەی كاتێك بیر دەكاتەوە لەوەی كە خودای گەورە چەند شتێكی داوەتە ئەو كەسەی بەرامبەر ئینجا چ (سامان یان دەسەڵات یان زانین و زانیاری) بێت وەنەیداوە بەو تووشی غەم و دڵتەنگی دەبێت و وەهیچی لەدەست نابێت كەئەم كردارەی پێ بگورێت لەبەر ئەوە گشت ئەم هۆكارانە لەناو دەروونی دا پەنگ دەخواتەوە و دایدە پۆشێ وەلەگەڵ رۆیشتنی كات دا بۆی دەبێت بە نەخۆشی و نەهامەتی.

وەخراپی حەسوودی لەوە دایە كەئەم كردارە خراپە دەبێتە هۆی لەناو بردنی پەیوەندی كۆمەڵایەتی لەنێوان چین و توێژەكانی كۆمەڵ دا چونكە ئەم كردارە خراپە دەبێتە هۆی ئەوەی هەندێك لەكۆمەڵ رقیان لەهەندێكی تر بێتەوە بەهۆی ئەوەی كەخودای گەورە شتی باشتری داوە بەوان و نەیداوەتە ئەوان وەدەكەونە باس كردنی ئەو كەسانە كەخودای گەورە چەند شتێكی زیاتری داینێ لەوان بۆ

ئەوەی لە نرخیان (مستوى)یان کەم بکەنەوە بەجۆرێك کەوا لەو کەسانە بەکەن کە لەماڵەوە دەرنەچن و لەکارو کردەوەکانیان بوەستن بۆ یەخودای گەورە نەهی لەحەسوودی بردن دەکات کە دەفەرمووێت: ﴿ولاتتمنوا مافضل الله به بعضكم على بعض للرجال نصيب مما اكتسبوا وللنساء نصيب مما اكتسبن وسئلوا الله من فضله ان الله كان بكل شيء عليماً﴾ النساء: ٣٢

واتە ئاوات مەخوازن بەوەی کە خوای پەروەردگار باوی هێندێکتانی پێ داوە بەسەر هێندێکیترتان داو بۆ پیاوان هەیە بەش لەوەی کە کردەوەو کۆشش بەرهەرمیان هێنابێت وە بۆ ئافرەتانیش هەیە بەش لەوەی کەبەکردەوە بەرهەمیان هێناوە وەحەسوودی مەبەن بەوەی کە خوای پەروەردگار داوێتی بەخەڵك بەڵکو داوابکەن لەخودا کەبە میهرەبانی خۆی بەشتان بدات کەهەمیشە زاناو ئاگادارە بەهەموو شتێك.

کەواتە هەموو کارو کردەوەکانی ئەو راستەو ئاوات حەسادەت بردن بەبەخشینەکانی خوای پەروەردگار زۆر بێ جێو نەزانینە بەوەی کە خوای پەروەردگار بەگەورەیی‌و زانینی خۆی شت دەدات بەبەندەکانی.

## چۆنیەتی رزگار بوون لە حەسوودی

پێغەمبەر (ﷺ) باسی ئەو رێگایەشمانی بۆ کردووە کەچۆن پێی رزگار دەبین لەو دەردەناخۆشە کە دەفەرموێت:

## کۆمەڵگای نموونەیی

**(اذا نظر احدکم الی من فضل علیه في المال والخلق فلینظر الی من هو اسفل منه ممن فضل علیه)** رواه بخاري

واتە ئەگەر کاتێك سەیری کەسێکتان کرد کەباری ئەو لەسامان و رەوشت زیاتر بوو بالەهەمان کات دا سەیری ئەو کەسانە بکات کەلەو لەژێر ترن کە باری ئەو چاکترەە لەو کەسانە.

بۆیە لەسەر ئادەمیزاد پێویستە بەکارو کردەوەکانی هەلبستێ کەئەنجامیان دەدات وە ئەو کردەوانە بەراوورد نەکات لەگەڵ ئەو کەسانە کە شەنسیان لەوزیاترە بەڵکو سەیری ئەوکەسانە بکات کەلەو کەمتر شەنسیان هەیە بەجۆرێك کەچاکەی خودای لەسەر بزانێت وەتۆ چەند بێ دارایی‌و سامان بیت کەسانێکی تر هەیە لەتۆ بێ دارایی‌و بێ سامان تر بین و یاخود تۆ چەند هەوڵ بدەیت ونەگەیتە ئەنجامێکی باش لەکارەکانتدا کەسانێکی‌تر هەن کەچەندین ساڵە هەوڵ دەدەن ناگەنە ئەنجام لەکارەکانیان داوە بەم کرداره جۆرە (قەناعەتێکت)بۆ دروست دەبێت و دڵ و دەروونت ئارامی دەیگرێت و دەحەسێتەوە وە بە بەرامبەرەکەت هەڵناچێت ئەگەر شتێکی لەتۆ زیاتر پێ درابوو.

وەلەکۆتاییدا بەپێویستی دەزانم کە بۆ خوێنەری بەرێز روون بکەمەوە کە حەسوودی تەنها لەدوو شت دا دەبێت بەپێی فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) :

**(عن ابي هريرة (رضي الله عنه) قال رسول الله (ﷺ): لاتحاسد الا في الاثنين: رجل اتاهُ الله القران فهو يتلوه اناء الليل والنهار يقول لو اتيت مثل ما أُتي هذا لفعلت كما يفعل، ورجل اتاه الله مالا ينفقه في حقه فيقول لو او تيت مثل ما اتـى لفعلت كما يفعل).** رواه بخاري

واتە حەسوودی بوون تەنها لەدوو رەوشت دا دەبێت یەکەم کەسێك کەخودا قورئانی پێ بەخشیوە بەجۆرێك کەبەشەو بەرۆژ دەیخوینێتەوە وەئەویش بلێت (ئەو کەسەی کەحەسوودی پێ دەبات) ئەگەر منیش وەکو ئەو کەسەم بۆ بهاتبایە وەکو ئەو دەم خوێندەوە.

**دووەم:** کەسێك کە خوای پەروەردگار سامانێکی پێ داوەو ئەو دیبەخشێ لەو مافەی کەپەیوەندی بەو سامانەوە هەیە ئەویش بلێت ئەگەر منیش ئەو سامانەم هەبوایە وەکو ئەو مافەکانیم دەبەخشی‌یەوە وەئەم دوو هۆکارە دەبنە هۆی دروست کردنی بەریەرەکانی لەدوو لایەنی باشدا کە قورئان خوێندن ومالّ بەخشینە بۆیە حەسوودی تیادا کار لەکردەوەکانی خاوەنەکەی ناکات.

## ٢- باس کردنی پاشەملە (الغيبة)

**غەیبەت:** واتە باس کردنی خەڵك بەچەند شتێك کە ئەگەر بۆی بگەرێتەوە پێی ناخۆش بێت جائەو باس کردنە لەرەگەزی بێت یان لەدرێژو کورتی بێت یاخود لەکردەوەی بێت وە کو بلێت (ئەو دوو رووە یان باوکی پینەچی‌یە یێان رەوشتی خراپە، درۆزنە، رەزیلە یان لەکاتی خواپەرستی‌دا بلێت ئەو کەسا نازانێ کرنۆش ببات یان لەگەڵ باوك و دایکی باش نی‌یە یان تەنها بلێت کراسی بەری رێك و پێك نی‌یە) ئەمانە گشتی باس کردنی بەخراپی‌یەو خاوەنەکەی پێی ناخۆشە ئەگەر بێت و بۆی بچێتەوەیان لەپێشی پێی بلێت وەئەم کارەش پێچەوانەی رەوشتی موسڵمانەو پێچەوانەی داواکاری خودایە لەسەر ئێمەی موسڵمان کە دەفەرموێت:

﴿يايها الذين امنوا اجتنبوا كثيراً من الظن ان بعض الظن اثم ولاتجسسوا ولا يغتب بعضكم بعضاً ايحب احدكم ان يأكل لحم اخيه ميتاً فكرهتموه واتقوا الله ان الله تواب رحيم﴾ الحجرات: ١٢.

واتە ئەی ئەو کەسانەی کەباوەڕتان هێناوە زۆر خۆتان بپارێزن لەگومان بە خەڵك چونکە گومان کردن بەخەڵکی بەبێ بەڵگە شتێکی گەورەو زۆر گوناهە وەدوای کارو کردەوە تایبەتی‌یەکانی خەڵك مەکەون و باسی خەڵك بەخراپە مەکەن بەو شتانەی کەپێیان ناخۆشەو نموونەیەکی خراپ بۆ ئەم کردەوە خراپە دەهێنێتەوە کەباس کردنی خەڵك وەکو ئەوە وایە کەتۆ گۆشتی برای خۆت بخۆیت کەئێوە چۆن لەو کردارە ڕادەکەن بە (طبیعة)ی خۆتان لەبەرگەورەیی ئەو کارە.

وەخراپی ئەو کارە لەوەدایە کەتۆ کاتێك باسی یەکێك دەکەیت بەخراپەو ئەو قسەیە بۆ خاوەنەکەی دەگەڕێتەوە ئیتر ئەویش لەجێگای خۆی بەدوای شتێك دەگەڕێت کەباسی تۆی پێوە بکات و ئینجا ئەم کارە بەرەبەرە گەورە دەبێت تاوەکو هەندێك جار دەگاتە پلەی شەڕ کردن و تێك دان هەر لەبەر ئەمە پێویستە هەر کەسێك کەباسی خەڵك دەکات بزانێت کەبەو کردارە تووشی تووڕەیی خوای پەروەردگار دەبیت وە دەبێتە هۆی لەناو چوونی چاکەکانی لەڕۆژی دواییدا لەبەر ئەوەی ئەو چاکانە دەگواسترێتەوە لەڕۆژی دواییدا بۆ تەرازووی ئەو کەسەی کەئەو باسی کردووە لە جیاتی ئەو قسانەی کە کردوویەتی لەسەر ناموسی (عرض) ئەو کەسە چونکە ووشەی نامووس مانایەکی فراوانی هەیە وەکو ڕەوشت و خراپەرستی وجل بەرگ ورەگەزو گشت کردەوەکانی‌تر کە پەیوەندی‌یان بەژیانەوە هەیە وە ئەگەر بێت و چاکەشی نەبێت ئەوا هەندێك لەخراپی ئەو کەسەی بۆ دەگوازرێتەوە نێو تەرازووی خراپی وە ئەمەش کردارێکی زۆر خراپە چونکە تەرازووی ئەو ڕۆژە

هیچ فێڵ نازانێت لە وانەیە تەنها بەکەم کردنەوەی چاکەیەك لەچاکەکانت یان بەزیاد کردنی خراپەیەك لەخراپەکانی ئەو کەسە لایەنی تەرازووت دا بشکێت ولەئەنجام دا بەرەو دۆزەخ بچێت.

وە کەمترین پلەی خراپی ئەم کارە ئەوەیە کەوەك کارلێ کەرێك کار لە هەندێك لەکردەوە چاکەکانمان دەکات ودەیان سڕێتەوە کە پێغەمبەرمان (ﷺ) دەفەرمووێت: **(ماالنار في اليبس باسرع من الغيبة في حسنات العبد)**

واتە ئاگر خێراتر نی یە کاتێك لەپوش وپەلاش هەڵدەگیرسێ لەخێرایی غەیبەت لەخواردنو سڕینەوەی چاکەکانی بەندەکان.

بۆیە پێویستە ئاگاداری خۆمان بین لەباس کردنی خەڵکی دا وە ناموسی خەڵکی باس نەکەی بۆ ئەوەی خۆمانی پێوە خەریك بکەین یان بۆ ئەوەی چەند کەسانێك بەپێکەنین بینین، وە پێغەمبەرمان (ﷺ) بەم جۆرە باسی غەیبەتی کردووە:

**(ذكرك اخاك بما يكرهه ، قيل: ارأيت ان كان في اخي ما اقوله؟ قال: ان كان فيه ماتقوله فقد اغتبته وان لم يكن فيه فقد بهته)** رواه مسلم والترمذي واحمد وابوا داود والدرامي.

پێغەمبەرمان (ﷺ) دەفەرمووێت غەیبەت ئەوەیە کەتۆ باسی براکەت بکەی بەو شێوەیەی کەپێی ناخۆش بێت، ئەوانیش وتیان ئەدی ئەگەر برایەکەم وەکو باسی دەکەم وابێت؟ ئەویش وتی: ئەگەر وابێت واتە غەیبەتت کردووە وەئەگەر وانەبێت واتە بوختانت پێ کردووە.

واتە ئەو شتەی کەتۆ باسی دەکەی وایە ڕاستە چونکە زۆر کەس دەبینین باسی خەڵك دەکەن پێیان دەڵێن باسیان مەکەم دەڵێن ئێمە بەراستی باسیان دەکەینو ئەمەش غەیبەت نی یە، بەڵام لەڕاستی دا ئەوە غەیبەتە بەپێی پێناسەی پێغەمبەر

(ﷺ) بۆ غەیبەت، ئەگەر وانەبێت کەواتە تۆ بەکەسەت هەڵبەستووەو بوختانت پێ کردووە کاتێك ئەوقسانەی لەسەر دەکەیت.

وەزۆر هۆیەکانی غەیبەت دەگەڕێتەوە بۆ حەسوودی چونکە زۆر کەس دەبینین کاتێك سەیری بەرامبەرەکەی دەکات سەرکەوتووە لەکارەکانی‌و خەڵك بەباشی باسی دەکەن ئەو خۆی پێ ڕاناگیرێت لەوکاتەدا وەدەست بەباس کردنی ئەو کەسە دەکات بۆ ئەوەی پارێزگاری لە ناوی خۆی بکات کاتێك خۆی بەراوورد دەکات لەگەڵ ئەو کەسەدا لەبەر ئەوەیە خودای گەورە دەبینین لەزۆر جێگا غەیبەت و حەسوودی پێکەوە دەبەستێتەوە:

**(رويَ انه (ﷺ) قال: من كانت لاخه عنده مظلمة في عرض او مال فليستحللها منه من قبل ان ياتي يوم ليس هناك ديناراً ولا درهم انما يؤخذ من حسناته فان لم يكن له حسنات اخذ من سيئات صاحبه فزيدت على سيئاته)** حديث صحيح

لێرە پێغەمبەر (ﷺ) جارێکی‌تر باسی ئەو کردارە خراپە دەکات و بەستەم ناوی دەباتوەدەفەرمووێت هەرکەسێك هیچ شتێکی لەسەر برایەکەی هەیە لە ناموس یان پارە، با بۆ خۆی حەڵاڵی بکات (واتە گەردنی خۆی پێ ئازاد بکات) لەپێش ئەو ڕۆژەی کەنەدینارو نەدرهەم هەیە بەڵکو بەگوێرەی چاکەکانی لێی وەردەگیرێت وەئەگەر چاکەش نەبێت ئەوا هەندێك لەخراپەی ئەو کەسە بۆ زیاد دەکرێتە سەر خراپەکانی.

## کەی دەتوانین باسی خەڵك بکەین

خودای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا ئەم ڕێگایەشی پێ داوین کە دەفەرمووێت:

﴿لايحب الله الجهر بالسوء من القول الا من ظلم وكان الله سميعاً عليماً﴾

**النساء: ١٤٨**

واتە خودا پـێی خۆش نیـیە ووتـن و دەربڕینـی بـەدوو خـراپ لەلایـەن هیـچ کەسێکەوە مەگەر کەسێك کەستەم و دەست درێژی لێ کرابـێ وە خـوداش هـەردەم زانایەو ئاگادارە.

واتە هیچ ڕێگرێـك نیـیە لەسـەر کەسـێك وەبـۆی بەغەیبە ئانوسرێت کـاتێك باسی کەسێك دەکات کەستەم و دەست درێژی لێ کردبێ وەشکایەتی لێ بکات یان وەڵامی جون و قسەی خراپی بداتەوە ئەمەش گشتی بـۆ پارێزگاری کۆمەڵـە لـەو جۆرەکـە سانە کەدەبنە مایەی تیر لەنێو دڵی کۆمەڵ و بەرەبەرە هـەموو چـین و توێژەکـانی کۆمەڵ لەیەکتر دەکەن بەجۆرێك کەبرا رقی لەبرا هەلبستێ ئەدی چـۆن بـرای ئـەوە واباسـی خراپـی ئـەو دەکـات چـۆن ئەمـە ڕوو دەدات وەلەئـەنجام دا بناغـەی کۆمەلایەتی تێك دەچێت و هەموو دەبن بە دوژمنی یەکتر.

بۆیە ئادەمیزاد دەبێ بزانێت بەباس کردنی خەڵکی توشی تووڕەیـی خـودا دەبێـت وە ئاشزانێ لە هەمان کات دا ئایا لە تووڕەیـی ئـەو کەسـانە رزگـاری بێـت کـە ئـەو باسەیان کردووە بەو جۆرە بۆیە خـودای گـەورە ئـەو جـۆرە کەسـانە فـڕێ دەداتـە (ویل) مەکە شوێنێکە لە دۆزەخ نوێژنەکەرانی دەچێتێ وە ئەم کەسانەشی دەچێتێ کەباسی خەڵك دەکەن کە دەفەرموێت:

﴿وَيْلٌ لِّكُلِّ هُمَزَةٍ لُّمَزَةٍ﴾

جا خوێنەری بەرێز خۆت لەو شوێنە رزگاری بکەو دوور بکەوە پێش ئـەوەی ڕۆژێك دابێت کە کار لەکار بترازێ و هیچت بۆ نـەکرێت لـەو کاتـەدا هـەروەها بـاس کردنـی خەڵکی ئادەمیزاد تووشی چەندین نەخۆشی دەروونـی دەکـات وە ئـەم نەخۆشـییە دەروونیانەش دەبنە هۆی نەخۆشی تر کە تووشی لەشی ئادەمیزاد دەبن.

لەبەر ئەوەی کاتێك تۆ باسی خەڵك دەکەی لە هەمان کات دا بیر لەوە دەکەیتـەوەو خۆت خەریك دەکەی ئاخۆ ئەو قسانەی کە کردووتە بۆ خاوەنەکەی دەچێتەوە یـان

نا وە ئەگەر بۆی چووەوە من وەلآمم چی بێت وەچەند بیرکردنەوەی تر تاوەکو هەندێك جار ئەو کەسەی کە باست کردووە دەیتەوە لات و چەندین جوێنت پێ دەدات و تۆش گەلێك جار توانای وەلآم دانەوەشت نابێت وە لە ناخت هەڵی دەگریت و دەبێتە هۆی تووش بوونت بە چەندین نەخۆشی.

ڕێگرتنی خودای گەورە لە ئەنجام دانی ئەم کارانە کە بە تەرازووی کردەوە دەمان ترسێنێ گشتی بۆ سوودی کۆمەڵ وتاکە سوودی کۆمەڵ لەوە دایە بۆ یەك گرتنی کۆمەڵ وە سوودی تاك لە ڕزگاربوونی لە چەندین نەخۆشی دەروونی و ڕزگاربوونیشی لە ڕۆژی دوایی دایە.

جا خوێنەری بەڕێز دەتۆش هەوڵ بدە سوود وەربگری و پارێزگاری لە مافی خۆت بکەی لە ژیانت و لە ڕۆژی دواییش دا.

**٣- النميمة**

**(عن ابي هريرة (رضي الله عنه) عن النبي (ﷺ) قال: من لم يدع قول الزور والعمل به والجهل فليس لله حاجةً أن يدع طعامه وشرابه)**

واتە هەرکەسێك واز نەهێنی لە هەڵبەستنی قسە بە خەڵکی و کاریکات بەو قسەیە بە نەزانی با هیچ بۆ خودا بەزۆری نەبێت واتە ئەم کردەوەیە کار لە ڕۆژیەکانمان دەکات.

پاش ئەم فەرموودەیە پێویستە بزانین نمیمی چییە؟ نمیمی بریتییە لە گواستنەوەی قسەو کردەوە لە نێوان دوو کەس یان زیاتر بە جۆرێك کە بەڕاستی نەیگێڕیەوەو یاخود بەڕاستیش بێت بەلآم مەبەستت تێك دانی نێوانیان بێت.

ئەمەش کردەوەیەکی زۆر خراپە لەبەر ئەوەی دەبێتە هۆی تێك دانی پەیوەندی کۆمەلآیەتی کە ئاین زۆر تەرکیزی لەسەر دەکات و هەردەم داوامان لێ دەکات کە بیپارێزین لەبەر ئەوەی هەر کۆمەڵێك کە پەیوەندی پچڕا لە نێوان چین و

توێژەکانی دا ژیان لەو کۆمەڵە وەکو بەندیخانەی لیٚ دێت بەجۆرێك هەرکەسێك وا هەست دەکات کە بەتەنیا دەژێت وەکەس لەخۆی بە نزیك نازانێت کە باسی ژیان و تەنگ و تەگەرەکانی بۆ بکات بۆ ئەوەی رزگاری بکات لەبەر ئەوە لە ئاییني ئیسلام زۆر جار ئەم خاڵە دووبارە کراوەتەوەو هەموو کردارەکانی نەهی لێکردووە کە دەبنە هۆی تێك دانی ئەم پەیوەندییە وە لە قورئانی پیرۆزدا خودای گەورەمان داوامان لیٚ دەکات کە خۆمان بپارێزین لە قسەی ناراست کە دەفەرموێت:

﴿واجتنبوا قول الزور﴾

بەڵیٚ لەسەر موسڵمان پێویستە خۆی بپارێزی لەم رەوشتە خراپەیە کە هیچ سوودێکی بۆ ئەو تیا نییە تەنها زەرەر نەبێت کە بەخۆی و بە کۆمەڵ دەگەیێنێت چونکە ئەنجامەکەی هەر دروست بوونی شەرو رق و کینە هەڵساندنە ئینجا لە هەر لایەکەوە بێت لە نێوان بەرامبەرەکەی یاخود وەکو باسمان کرد لە نێوان خۆی و بەرامبەرەکانیدا وە بەم جۆرە پەیوەندی نێوانیان دەپچرێت و بە درۆزن و ناپاك ناوی دەبن.

هەروەها قورئانی پیرۆز نەمیمی بە یەکێك لەو رەوشتانەی دادەنێت کە بیٚ باوەڕو دووڕووەکانی پیٚی دەناسرێن کە دەفەرموێت:

﴿ولاتطع كل حلاف مهين * هماز مشاء بنميم﴾ القلم: ١٠

واتە بەگوێ و بدوای ئەو کەسانە مەکەوە کە زۆر سوێند دەخۆن بە درۆو باسی خەڵك دەکەن بۆ تێك چوونی نێوانیان کە هەردەم هەوڵی بۆ دەدەن.

ئەم کردەوەیەش بە یەکێك لە نەخۆشییە دەروونییەکان دادەنرێت کە تووشی ئادەمیزاد دەبێت وە هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ دوودڵی باوەڕو حەسوودی بردن بەبەرامبەر کە زۆر کەس دەبینیت کە سەیری چەند کەسانێکی بەرامبەری دەکات

زۆر لەگەڵ یەكدا رێك وپێكن وە بەهانای یەكتر دا دێن ئەو زۆر ئەوەی پـێ ناخۆشـە و هـەوڵ دەدات ئـەم پەیوەندییە لـە نێوانیـان دا تێـك بـدات ئینجـا كاردەكـات بـۆ گواستنەوەو هەڵ بەستنی قسەی ناراست لە نێوانیان دا.

بۆیە ئەم جۆرە كەسانە پێویستیان بە چارەسەرێكی دەروونـی هەیـە ئـەویش بـاس كردن و یاد كردنەوەی خودای گەورەیە لە هەموو كارەكانیان دا بۆ ئەوەی لەم كارە رزگاریان بێت. كە خودای گەورە دەفەرمووێت:

﴿ألا بذكر الله تطمئن القلوب﴾

وە لە خراپی ئەم كردەوەیەدا پێغەمبەرمان (ﷺ) دەفەرمووێت:

**عن ابي هريرة (رضي الله عنه) قال: قال النـبي (ﷺ) تجـد مـن شـر النـاس يـوم القيامة عند الله ذا الوجهين الذي ياتي هؤلاء بوجهٍ وهؤلاء بوجه)**

واتە خراپترین كەس لەلای خودای گەورە لە رۆژی دواییدا دووروو وە كـە بـەرووێك دێتە لای ئەمانەو بە رووێكیتر بۆ لای ئەوانی تر دەچێت.

## باسی چوارەم (وەرنەگرەكان)

### ١- خێر كردن بە ماڵی حەرام:

خودای گەورە دەفەرمووێت:

﴿يا أيها الذين آمنوا انفقوا من الطيبات ماكسبتم ومما اخرجنا لكـم مـن الارض ولا تيمموا الخبيث منه تنفقون﴾ البقرة: ٢٦٧

واتە ئەی ئەو كەسانەی كە بڕواتان هێناوە بەخت بكەن و ببەخشن لە رێگـای خـودای گەورە دارایی چاك و بە نرخ لەوەی كە بە كـارو كاسبی پـەیداتان كـردووە وە لـەو بەروبوومە چاكانەی كـە لـە زەویدا دەرمـان هێنـاوە بۆتـان وە مەگـەرێن بـە دوای

خراپ و بێنرخ تاوەکو لەوەی بەخت بکەن و بیدەن لە ڕێی خودا دا لە کاتێك دا ئەگەر بدرێ بە خۆتان وەری ناگرن مەگەر بەچاو پۆش و شەرمەوە نەبێت.

خوێنەری بەرێز ئەمەیە پەیامی موسڵمانان سەیر بکەو چۆن ڕۆڵەکانی خۆی لەسەر ڕێگای ڕاست و دروست پەروەردە دەکات وە هانیان دەدات لە بەخت کردنی ماڵ و سامانیشیان شتی بە نرخ و باش پێش کەش بکەن بۆ ئەوەی خۆشەوەیستی سامانیان نەچێتە دڵیانەوە لەسەر ئەم خاڵە خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرمووێت:

﴿لن تنالوا البر حتى تُنفقوا مما تُحبون﴾ آل عمران: ٩٢

واتە پاداشت وەرناگرن تاوەکو بەخت نەکەن لەو شتانەی کە خۆشتان دەوێت.

لەم دوو ئایەتەدا خودای گەورە هانمان دەدات بۆ فێرکردن و بەخت کردنی سامان و دارایی چاك لە ڕێگای خودای گەورەدا وە لەو شتانەی کە حەز دەکەین هەردەم بۆخۆمان بێت لەبەرئەوەی خودای گەورە شتی خراپ وەرناگرێت و پاداشت بۆ خاوەنەکەی نانوسرێت لەبەری ئەو شتە خراپەدا.

**عن ابي هريرة (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (ﷺ) (ان الله طيبٌ لا يقبل إلاّ الطيباً وان الله امر المؤمنين بما امر به المرسلين: فقال تعالى** ﴿يا أيها الرُسُل كلوا من الطيبات واعملوا صالحاً﴾ **وقال تعالى:** ﴿يا أيها الذين آمنوا كلوا من الطيبات ما رزقناكم﴾ **ثم ذكر الرجل يُطيل السفر أشعث أغبر يمد يديه الى السماء يارب يارب ومطعمه حرام ومشربه حرام وملبسه حرام وغذي بالحرام فأنّى يُستجاب لذلك)** **رواه مسلم**

واتە خودای گەورە پاك و بێگەردە و تەنها پاك و بێ گەرد نەبێ وەرناگرێ.

وەخودای گەورە فەرمانی داوەتـە خـاوەن بـاوەران بـەم جۆرەی فـەرمانی داوەتـە پێغەمبەران کە دەفەرموویت ئەی پێغەمبـەرانی مـن شـتی پـاك و حـەلاڵ بخـۆن وە بەکاری بهێنن وە کردەوەی باش بکەن وە هەر بـەو جـۆرە خـودای گـەورە فـەرمان دەداتە باوەداران و دەفەرموویت ئەی خاوەن باوەران لەو حەلاڵ و بیٚگەردە بخـۆن و بەکاری بهێنن کە داومانە بە ئێوە.

وەهەر لەم فەرموودەیەدا پێغەمبەر (ﷺ) باسی جۆرە پیاوێك دەکات کـە رێگایـەکی دوور و درێژی بڕیوە وە وای لیٚدێت موی سەری نارێك دەبێـت و تـۆزاوی دەبێـت وە دەستی خۆی بەرز دەکاتەوە بۆ ئاسمان و لە خـودای گـەورە دەپارێتـەوەو دەڵێت خودایە لەوە رزگارم بکە خودایە ئەم شتەم بدیٚ لەگەڵ ئەوەش دا خواردەمەنی ئەم رێبوارە حەرامەو هەر بە حـەرامی پـیٚ گـەێندراوەو گـەورە بـووە چـۆن ئـەم جـۆرە کەسە پارانەوەی قبوولٚ دەبێت واتە قەبوولٚ نابێت.

بەڵیٚ خودای گەورە خاوێنەو تەنها شتی خاوێن نەبێت وەرناگرێت واتـە هـەر شـتێك کە بەخۆت ئەی خۆی و بەکاری دەهێنی یان بۆ ماڵ و منالٚت بەکاری دەهێنی دەبیٚ لەو بیٚ بەخشی وە دەبێت ئەم شتە حەلاڵ بێت ئەگـەر بـەنیازی پاداشـت وەرگرتـن بی بەخشی هەروەها دەبێـت لـەپێناو خـودای گـەورە بێـت تـاوەکو بـۆت بـە چاکـە بنووسرێت لە تەرازووی چاکەکانت دا.

**(عن ابن عمر (رض عنهما) عن النبي (ﷺ) قـال: لا يقبـل الله صلاة بغـير طـهور و لاصدقة من غلول)** رواه الخمسة إلاّ الترمذي

واتە: خودای گەورە نە نوێژ بەبیٚ دەست نوێژ وەردەگرێت وە نەخێر لـەگزی و دزی وەردەگرێت.

**عن ابن مسعود :قال الرسول (ﷺ) لا يكسب عبد مالاً حراماً و تصدق به فيقبل منـه ولا ينفق منه فيبارك الله لة فيه و لا يتركه خلف ظهره إلاّ كان زاده الى النار إن الله**

**تعالى لا يمحو السيء بالسيء ولكن يمحو السيء بالحسن ان الخبيث لا يمحو الخبيث.** رواه احمد

حەرام هەر حەرامە هەر چەندە نیازی ئەو کەسەی کە پێی هەڵدەستێ باش بێت و هەرچەندە مەبەستی چاکە بێت وە پەیامی موسڵمانیەتی بە هیچ جۆرێك رازی نابێت کە حەرام ببێتە ئامرازێك بۆ گەیشتن بە ئامانج و مەبەستی بۆیە گەیشتن بە ماف دەبێت لە رێگای مافەوە بێت بە تەنها.

هەر لەبەر ئەوە پاداشتی ئەو کەسە نادرێتوە و گوناهی لەسەر هەڵناستێت هەرچەندە ماڵی خۆی ببەخشێت ئەگەر بێت و ئەو ماڵ و سامانەی لە رێگای ریباو قومار و هەر رێگەیەکی تر کە خودای گەورە رێگای پێ نەدابێت کە تێیدا ماڵ سامان کۆبکرێتەوە واتە خراپی ئەم کارە لەسەر ئەم جۆرە کەسانە ناسرێتەوەو هەڵ ناگیرێت با هەر مەبەستیشیان چاکە بێت لەبەر ئەوەی سەرچاوەی ئەم ماڵەیە خراپە لەبەر ئەوە دەرئەنجامیشی هەر خراپەو بە چاکە بۆ خاوەنەکەی نانووسرێت ولێی وەرناگیرێت.

**٢- باوەڕکردن بە جادووگەر:**

**قال عليه الصلاة السلام (من أتى عرّافاً فساله عن شيءٍ فصدقه بما قال لم تقبل له صلاة أربعين يوماً)** رواه مسلم

واتە هەرکەسێك بچێت بۆلای ئەو کەسانەی کە بە عراف ناسراون بۆ ئەوەی پرسیاری لێ بکات لە هەندێك شت و باوەری پێ بکات ئەوا نوێژی لێ وەرناگیرێت لە ماوەی چل رۆژی داهاتوودا.

**جادووگەر:** ئەو کەسانەن کە پرو پاگەندە دەکەن بەوەی کە دەتوانن هەموو شتێك دەربارەی بزر بووەکان و نادیارەکانی داهاتوو بدۆزنەوەو پەردە لەسەر نوسراوی داهاتوو هەڵ بگرن و بیدۆزنەوە.

باوەر كردن بەو جۆرە كەسانە مرۆڤ دەخاتە خانەی ئەو كەسانەی كە باوەریان نەهێناوە بە پێغەمبەر (ﷺ) لەبەر ئەوەی كاری ئەم جادوو كەرانە پێچەوانەی یاساو پەیامی خودایە وە پێچەوانەی گشت ئەم ئایەتانەیە كە بۆمان روون دەكەنەوە كە كەس لەخودا زیاتر ناتوانێ شتێك لەنادیار بزانێ وە كەس بۆی نییە پەردە لەسەر قەدەر هەڵ بگرێ و بیدۆزێتەوە كە دەفەرموێت :

﴿قل لا اقول لكم عندي خزائن الله ولا اعلم الغيب ولا اقول لكم اني ملك ان اتبع الا ما يوحى الي﴾ الانعام :٥٠

لەم ئایەتەدا خودای گەورە بەپێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ: بلێ من هیچ شتێكم لانییە لە كۆكراوەی زانستی خودای گەورە لەو زانستانەی كە بۆ كەس نییە لەئادەمیزاد بیزانێت لەبەر ئەوكەس ئاگات بەم پلەیە وە هیچ لەداهاتووی نادیار نازانم وەناش لێم من فریشتەم بەڵكو تەنها بەدوای ئەو شتە دەكەوم كە پێك رادەگەیەندرێت.

لەم ئایەتەدا بۆمان روون دەبێتەوە كە پێغەمبەرانیش بۆیان نییە لەم زانستە بزانن وپەردە لەسەر نادیار هەلبگرن لەبەر ئەوەی ئەم زانستە پەیوەندی تەنها بەخودای گەورەوەهەیە وەبەهیچ كەسێكی ترەوەنییە.

**وقال عليه الصلاة السلام: من اتى كاهناً فصدقه بما قال فقد كفر بما انزل على محمد (ﷺ)** رواه البزاز

لەم فەرموودەیەش دا پێغەمبەر (ﷺ) ئاگادارمان دەكاتەوە لەو كردارە خراپەو پێمان رادەگەیەنێ كەهەركەسێك باوەڕ بەم جۆرە كەسانە بكات ئەوا بابزنێ ئەو كەسە باوەڕی نەماوە بەوەی كە بۆمن هاتۆتە خوارەوە.

ئەدی چۆن تۆ کاتێك باوەڕ بەم جۆرەکەسانە دەکەیت تۆ وادەگەیەنی کەتۆ باوەڕت نییە بەو هەموو ئایەتانەی کەپێت رادەگەێنن کەتەنها خودای گەورە و میهرەبان لەتوانای داهەیە نادیار بزانێ بۆیە لە کردەوەکانمان دا خودای گەورە لەسەر ئەم بابەتە دەفەرموێت: ﴿وَأَن تَسْتَقْسِمُوا بِالْأَزْلَامِ ذَٰلِكُمْ فِسْقٌ﴾ المائدة: ٣

واتە لەرێگا دەردەچێت ئەگەر بێت و پەنا ببەیتە بەر ئەزلام بۆ زانینی ئەو شتانەی کەلەو کارەیان لەو گەشتەی کەدێتە پێشەوە بیزانێ.

لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە ئەوش ئایا ئەزلام چی‌یە؟

**ئەزلام:** لەناو عەرەباکان پێ یان دەگووت (اقـدح) وبریتـی بـوو لەسـێ تـیر لـەناو کیفکەێك کەتەنها کۆتایی ئەم تیرانـە تیـادا بـەدیار دەکـەوت کـە لەسـەر یـەکێکیان نووسراو بوو (نهانی ربی) وە لەسەر دووهەمیان نووسرابوو (امرنـی ربـي) وەلەسـەر سێ هەمیان هیچ نەنوسرابوو.

ئەگەر بهاتبایە سەفەرێکیان هەبوایە یان ژنیان هێنابا وەهەر شـتێکی‌تر لـەو بابەتـە دەهاتن بۆ ئەم شوێنەی کەئەم تیرانەیان لێ دادەنا لەلای بتەکان وە ئەم تیرانـەیان رادەکێشا ئەگەر تیری (امرنی ربی) رابکێشـرابایە ئـەوا کارەکـەیان ئـەنجام دەدا وە ئەگـەر بەپێچەوانـەوە (نـهانی ربـي) بوایـە ئـەوا ئـەنجامیان نـەدەدا وەئەگـەر (بـێ نووسینەکە) دەرچوو بووایە دووبارەو سێ بازەیان دەکردەوە هەتاوەکو امرنی یـان نهانی دەردەچوو.

وەلەسەردەمی تازەدا چەندین جۆر شـتی وادەبینـین کەهـەندێك کتـاب دەکەنـەوەو خاڵ خاڵ دادە نێن بۆ زانینی هەندێك شتی نادیار بەنەزانی خۆیان بەهۆی ئەم خـاڵ خاڵ کردنەوە هەندێکی‌تر فنجان دەخۆنەوە...هتد ئەم کارانەش گشـتی دەرچوونـە لەرێگای ڕاستی و حەرامە.

**کۆمەڵگای نموونەیی**

**قال النبي (ﷺ): (لاینال الدرجات العلي من تكهن او استقسم او رجع من سفر تطيرا)** رواه الشيخان

واتە پلەی بەرز وەرناگیرێت هەرکەسێك کەباوەڕی بەو کارانە هەبێت وەبگەڕێتەوە لەگەشتەکەی و ئەنجامی نەدات بەهۆی باڵندە فڕێ دان.

وەئەم کارەش لەکاتی گەشت دابەکاریان دەهێناو باڵندە یان کۆتریان فڕێ دەدا ئاسمان وبەهۆی ڕێرەوی ڕۆیشتنی ئەم باڵندەیەوەك (بەرە راست یان چەپ) سەفەرەکەیان دەکرد یان نەیان دەکرد.

لەدرێژ زەمانەوە و پێش هاتنی پێغەمبەر (ﷺ) کۆمەلێك کەس بەناوی (الكهان) هەبوون کەپیشەیان هەڵ خەڵەتاندنی خەڵك بوو بەوەی کەلەبارەی شاراوەکانی داهاتوو رابردوو دەزانن.

ئەمەش بەوەی کەدەتوانن پەیوەندی بەکۆمەڵی (جن) بکەن یان بەهەر رێگایەکی‌تر.

وەکاتێك پێغەمبەر (ﷺ) چاوی بەو کۆمەڵەکەوت ئەم ئایەتەی لەخودای گەورە بۆمان گێراوە:

﴿قل لايعلم من في السموات والارض الغيب الاالله﴾ النمل: ٦٥

کەواتە نەفریشتە وەنەجن وە نە ئادەمیزاد ناتوانن هیچ لەشاراوەکان بزانن.

﴿لو كنت اعلم الغيب لاستكثرت من الخير وما مسني السوء ان انا الا نذير وبشير لقوم يؤمنون﴾ الاعراف: ١٨٨

وە لە سەر (جن) سليمان

﴿ان لو كانوا يعلمون الغيب مالبثوا في العذاب المهين﴾ سبأ: ١٤

لەبە ئەوەی هەركەسێك پروپاگەندەی ئەوە بكات كەئەو لەشاراوەی ڕاستی دەزانـێ ئەوا درۆزنەو درۆ دەكات لەخەڵك و بەراستی.

**وعن عائشة (رضي الله عنها) قالت سأل رسول الله (ﷺ) اناس عـن الكـهان فقـال: ليسوا بشيء، فقالوا يا رسول الله انهم يحدثوننا عن احياناً بشيء فيكون حقاً فقـال رسول الله (ﷺ) تلك الكلمة من الحق يخطفها الجن فيقرها في اذن وليه فيخلطـون معها مائة كذبة)** متفق عليه.

واتە هەندێك خەڵك پرسیاریان لە پێغەمبەر (ﷺ) كرد دەربارەی (كـهان) وە ئـەویش وەڵامی داوەو ووتی ئەمانە هیچ نینە ئەوانیش ووتیان ئەی پێغەمبەری خوا ئەوانـە هـەندێك جـار قسـەیان پـێ دەڵێـن و ڕاسـت دەردەچـێ پێغەمبـەریش (ﷺ) وەڵامـی دانەوەو ووتی: ئەوە ووشـەیەكە لەڕاستی جنۆكـە هـەڵی دەگرنـەوەو دەیخاتـە بـن گوێی خاوەنەكەی وەسەدان درۆی لەگەڵ تێكەڵ دەكەن.

٤-تەواو نەكردنی ئەو مەرجانەی كەخودی گەورەداینـاوە بۆ وەرگرتن.

هـەندێك جـار ئـەو كردەوە چاكانـەی كەئـەنجامی دەدەیـن وەرناگـیرێت بـەهۆی ناتەواوی ئـەو مەرجانـەی كـەبۆی دانـراوە لەلایـەن خـودای گـەورە بۆئـەنجام دانی وەسوودی دانانی ئەو مەرجانە بۆ ڕێكخستن و داهێنانی بەرزترین ڕەوشت و ڕووكاری بەندایەتی‌یـە لـەئادەمیزاددا، ئەمـە لەلایـەك لەلایـەكی تریشـەوە ڕەچـاوكردنی ئـەم مەرجانەو پاراستنی دەبێتە هۆی بەرزكردنەوەی ئایین و پیشاندانی وێنەی ڕاستی موسڵمانەتی وەكو ئەو مەرجانەی دانـراوە لـەنوێژ كـردن و ڕۆژی گرتـن ولێ بـووردن (التوبة)و ..هتد.

وەلێرەدا بەكورتی چەند نموونەیەك دەهێنینەوە كەپەیوەندی بەنوێژەوە هەیە.

١- یەكێك لەمەرجەكانی نوێژ كردن هەڵگرتنی دەسـت نوێـژە بۆیـە ئەرگـەر بێـت و نوێـژ بـەبێ دەسـت نوێـژ هـەڵگرتن ئـەنجام بدەی نوێژەكـەت وەرناگـیرێت و

کۆمەڵگای نموونەیی

بەسەرت دا دەدێتەوە لەبەر ئەوەی دەست نوێژ هەڵگرتن بەدوو کرداری سەرەکی هەڵدەستێ.

**یەکەمیان:** کردارێکی خۆ ئامادەکردنە بۆ نوێژ کردن لەبەر ئەوەی ناوەرۆکی نوێژ بەریتییە لەراوەستان بەمل کەچی بەرامبەر خودای گەورە وەبۆ ئەم مەبەستە پێویستە ئادەمیزاد هەموو توانای بخاتە کار بۆئەوی بەبیر کردنەوەیەکی ساف بەرامبەر خودای گەورەو میهرەبان رابوەستێت.

لەبەر ئەوەی نوێژ کردن بەشێوەیەکی راست و رەوان وەکو شوێنێکی حەسانەوە وایە کە ئادەمیزاد تیادا دەحەسێتەوە ودوور دەکەوێتەوە لەوهەموو پالەپەستۆیانەی ژیانی کەدەکەوێتە سەری وەکاتێك کەلەنوێژەکانی دەبێتەوە هەست بەخۆشی ونارامی دڵ دەروونی دەکات کەهەندێك جار دەبێتە هۆی زاڵ بوونی بەسەر ئەو کارانەی کەپێش نوێژ کردن نەدەکرا.

ئەمەش یەکێك لەگرنگییەکانی نوێژمان بۆ بەدیار دەخات لەبەر ئەوەی لەکاتی ئەنجام دانی ئەم پێنج نوێژە لەرۆژێك دا ئەگەر بێت و ئێمە لێکی بدەینەوە دەبینین نوێژ بە کارێکی رێکخستن هەڵدە ستێ لەژیانی ئادەمیزاد دا کاتێك سەیری کاتی نوێژەکان دەکەین.

دووەم: بۆ خاوێن کردنەوەی ئەندامەکانی لەش بەتایبەتی ئەوئەندامانەی کە بەهۆی کاری رۆژانە پیس دەبن بۆ ئەم مەبەستە خوای پەروەردگار لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت:

﴿یاایها الذین امنوا اذا قمتم الی الصلاة فاغسلوا وجوهکم وایدکم الی المرافق وامسحوا برؤسکم وارجلکم الی الکعبین﴾

واتە ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە بە پەیامی موسڵمانیەتی کاتێك ویستتان بچن بۆ نوێژ کردن ڕووخسارو دەم و چاوتان پشۆن لەپاشان دەستەکانتان هەتا ئانیشکتان دوای ئەوە دەستی تەڕبهێنن بەسەرتان دا ئینجا قاچەکانتان بشۆن هەتا دەگاتە دوو قوڵایەکانتان، هەروەها پێغەمبەرمان(ﷺ) لە فەرموودەکانیدا گرنگی دەست نوێژ هەلگرتنمان بۆ دووبارە دەکاتەوە کە دەفەرموێت :

**عن ابي هريرة (رضي الله عنه) عن لنبي (ﷺ) قال: (لا صلاة لمن لا وضوء له ولا وضوء لمن لم يذكر اسم الله عليه ).** رواه ابو داود والترمذي

واتە نوێژی بەبێ دەست نوێژ هەلگرتن وەرناگیرێت و دەست نوێژ هەلگرتنیش تەواو نابێت ئەگەر بێت و ناوی خودای گەورەی لەگەڵ دا نەهێنێت.

جگە لەمانەی کە باسمان کرد دەست نوێژ هەلگرتن بەکارێکی ڕەش کەرەوەی گوناهەکانمان هەڵدەستێت ئەوەش بەگوێرەی ئەو فەرموودەی پێغەمبەرمان (ﷺ) کە دەفەرموێت:

**عن ابي هريرة (رضي الله عنه) عن النبي (ﷺ) قال: (ارايتم لو ان نهرا بباب احدكم يغتسل منه كل يوم خمس مرات هل يبقى من درنه شيء قال فذلك مثل الصلوات الخمس يمحوا الله بها الخطايا ).** رواه الخمسة الا ابا داود

مانای ئەم فەرموودەیە ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێت) گوتی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی پێم بلێن ئەگەر جۆگە ئاوێك لەبەر دەرگای یەکێکتان دابێت وەهەموو ڕۆژێك پێنج جار خۆی تیادا بشوات ئایا هیچ چلکی پێوە دەمینێ؟ ئەوانیش وتیان نەخێر هیچ چلکی پێوە نامینێت. فەرمووی: ئەوە وەکو ئەو وێنەی ئەم پێنج نوێژە وایە گوناهمان پێ ڕەش دەبێتەوە.

٢-مەرجی دووەم لەنوێژدا پێویستە ڕووی ئەو کەسەی کە نوێژ دەکات بەرەو قیبلە بێت هۆی ئەمەش بۆ ئەوەی یەکگرتنی ڕووی نوێژ کردن لە لایەن موسڵمان دروست

بێت لە لایەك لە لایەکی تریشەوە وەکو ئاگادارکردنەوەیێکە بۆ گرنگی یەکگرتن کە پێویستە کۆمەڵ بەهەموو توانایەوە هەوڵی بۆ بدات وە لەسەر تاکیش پێویستە پارێزگاری لێبکات.

لەبەر ئەوەی کاتێك کۆمەڵ یەکی گرت هیچ هێزێك لەدنیادا نیە بتوانێ زاڵ بێت بەسەری دا تاوەکو درزێك لەم یەکگرتنە دروست بکات، بۆیە پەنا دەباتە بەر تاك بۆ چەواشەکردنی تاکو بتوانێ درزێك لەم یەکگرتنە دروست بکات بۆیە دەڵێم پێویستە لەسەر ئادەمیزاد رێزی گەل بپارێزێت و هەوڵ بدات شتێك بۆ نیشتمانەکەی بکات نەك چاوەروانبێت تاوەکو بزانێ دەست هەلات داران چی بۆ دەکەن لەبەر ئەوەی ئادەمیزاد بناغەی کۆمەڵە کە بەگوێرەی ئەو نیشتمان بنیات دەکرێت و ئاوەدانی دەکرێتەوە.

٣-مەرجی سێیەم: بزیتی‌یە لە پاك و خاوێنی جل و بەرگ لەشتی پیس هەروەها ئەو شوێنەی کە نوێژیشی تیادا ئەنجام دەدرێت پێویستە پاك و خاوین بێت. خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت :

﴿وثيابك فطهر﴾ المدثر: ٤

واتە جل و بەرگت خاوین بکەوە لەپیسی ئەویش گشتی بۆ لێراهاتنی موسڵمانە لە پاك و خاوێنی لەش و جلو بەرگی و دوورکەوتنەوەی لەپیسی کە هەردەم دەبێتە هۆی توش بوونی ئادەمیزاد بە نەخۆشی ئەمەش یەکێکە لە مەرجەکانی موسڵمانیەتی بەپێی فەرموودەی پێغەمبەرمان (ﷺ) دکە دەفەرموێت: **(تنظفوا فان الاسلام نظيف)**

بەڵێ پاك و خاوێنی یەکێکە لە مەرجەکانی موسڵمان بوون لەبەر ئەوەی موسڵمانیەتی خاوێنە بۆیە دەبێت لەکاتی ئەنجام دانی کردەوەو داواکاریەکانی پەیامی موسڵمانیەتی بەشێوەیەکی خاوێن و بەنیازێکی باش ئەنجامی بدەین.

